لێی ئەدوێین بە بێ هیچ پێویستی‌یەك‌و بەڵكو بەهەڵەیش (دیدەکانم)ی عەبدوررەحمان سەعیدو (چاوەکانم)ی گیو موکریانیی کرد بە (دیدە کانم) . دووەمیش ئێمە لەخۆمانەوە نەمانووسیوە (دیدە کانی) ، بەگوێرەی دەسنووسی مەلا رەئووفیش هەر (دیدە کانی)یە ، کەواتە ئێمە نین دەسکاریی بێ‌بەڵگەی شیعری حاجی قادرمان کردووە ، ئەوە .

لەبارەی بەیتی :

**حـــاجی کەسێکە بێ‌کەس بۆ ئێوە قور دەپێوێ**
**گوێی لێ دەگرن زەریفە ، ناگرن بەلا لە خۆتان**

(ب ١ ، ل ٨٩)یشەوە ، نووسیویە : «نیو دێڕی دووەم لە چاپەکەی (گ.م)دا بەم‌جۆرە هاتووە : (گوویێ لێ‌دەکەن زەریفە ، نایکەن بەلا لە خۆتان) . نازانم بۆ لە چاپی تازەدا گۆڕدراوەو ، پشت بە چ تێکستێك بەستراوە ؟ خۆ ئەگەر ئیجتیهادە دەبا لەوبەیتەش کرابا کە دەڵێ :

کـــێ دەڵێ کوردەکان بە ئیدراکن
بەسە ئەم نەقصە گوێ لە من ناکەن

وابزانم ئێرە بۆ کەمێ ڕێکیی سەروا زیاتر پێویستی بە دەسکاری‌یەکە هەیە ، ئەمە ئەگەر لەوێدا هەر پێویستی هەبێ ؛ چونکە بە بۆچوونی من (گوێی (گێی) لێ دەکەن) نەك هەر ناهەموار نی‌یەو بەس ، بەڵکو باشتریشە لە (گوێی لێ دەگرن) چونکە لە یەکەم سەرەڕای گوێ‌گرتن ، دەبێ رووی کونەگوێ بەرانبەر دەمی قسەکەر بێ ، کەچی لە دووەم بەس گوێ‌گرتن هەیە ، جا رووی کونەگوێ لەکوێ‌یە ، گرنگ نی‌یە» .

منیش ئەڵێم : هەرچەند گێرەو کێشەکە لەسەر وشەی (دەگرن)و (ناگرن)ە ، پێویستە لەپێشا ئەوە بڵێم کە (گووێ‌ی) کە کاك فایز بە ڕاستی زانیوەو (و)ەکەی تیا ئیشباع‌کراوە ، نیوە بەیتەکە لەنگ‌ئەکاو ، هەر ئەبێ (گوێی)و بەڵکو بە دیالێکتی کۆیە (گێی) بێ . هەروەها هیچیش لەوە حاڵی نەبووم کە ئەڵێ : «وابزانم ئێرە . .» تا ئەگاتە «چونکە . .» . ئەنجا بێینەوە سەر ئەسڵی مەبەست : لەبارەی تێکستی پاڵپشتەوە ، تێکستی پاڵپشت دەسنووسەکەی مەلا رەئووف سەلیم‌ئاغایە کە لامان وایە تێکرا باشترین دەسنووسە تائێستا وەگیرکەوتبێ . ئەگەر کاك فایز لەرووی سەنگی بەیتەکەوە رەخنەی بگرتایە . رەخنەکەی زۆر بەجێ‌بوو چونکە (دەگرن)و (ناگرن) بەیتەکە لەنگ ئەکەن‌و ، لە تێکستی عەبدوررەحمان سەعیدیشدا (دەکەی)و (ناکەن)ە کە بۆمان هەیە بڵێین (دەکەی)ەکە هەڵەیەو ڕاستەکەی (دەکەن)ە چونکە قسە لەگەڵ کۆمەڵ ئەکاو . لە تێکستی چاپی سێهەمی گیو موکریانی‌یشدا (دەکەن)و (ناکەن)ە ، بەڵام جیاوازی دانان لەنێوان (گوێ‌گرتن)و (گوێ‌لێ‌کردن) ئەوە بەڵگەیەکی لە زمانی کوردیدا نی‌یە . چونکە ئەم دوانەیش هەن‌و (بەگوێ‌کردن)یش هەیەو. هەر لەم‌مەعنایانەدا وشەی‌تریش هەیە . هیچ مەرجیش نی‌یە لە (گوێ‌گرتن)دا کونەگوێی گوێ‌گر بەرانبەر بە دەمی قسەکەر بێ .

لەبارەی بەیتی :

**دو گەز زەمین‌و سێ گەز جاوو مستە خۆڵێکە**
**لیبـــاسی پێخەف‌و رایەخ هەتا دەگاتە سەرین**

(ب ٧ ، ل ٩٦)یشەوە ، نووسیویە : (لیباسی) هەڵەیە . دەبێ (لیباس‌و پێخەف . . ی) بێ . خۆ ئەگەر بڵێین (ی)کە ڕاناوەو بۆ (خەلایق) دەگەڕێتەوە کە لە بەیتی پێشوودا گوترا (خەلایقیش کۆچە) ، ئەوا دەبێ بەدوای (ڕایەخ)ەوە بلکێندرێ‌و بنووسرێ : (لیباس‌و پێخەف‌و رایەخی . . .)» .

منیش ئەڵێم : مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی‌یش ڕایەکی‌وای پیشاندابوو[9] و منیش تارادەیەك پەسەندم کردبوو[10] . بەڵام ئێستا پەشیمانم لەوەو ، لام‌وایە هەرچەند ئەگەر مەبەستمان بێ پێوەندی ئەم بەیتە بە بەیتی پێشووەوە ببرین ، ئەتوانین بڵێین ڕاستە (لیباس‌و . .)وە چونکە بەپێی شێوەنووسینی کۆن کە نووسراوە (لباس پیخف رایخ . .) وئەتوانین بەگوێرەی مەعنا بە (لیباس‌و) و بە (لیباسی)یشی بخوێنینەوە ، ئەبێ حیسابێك بۆ سێ تێکستی مەلا ڕەئووف‌و

عەبدوررەحمان سەعیدو گیو موکریانی‌یش بکەین کە هەر سیانیان (لیباسی)یان نووسیوەو ، بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی کاك فایزەوە ئەتوانین ضەمیری (ی)ی (لیباسی) بۆ (خەلائیق) بگێرینەوەو فاریزەیەکی لەدواوە دانێین‌و (پێخەف‌و رایەخ هەتا دەگاتە سەرین) بکەین بە شەرح‌و لێکدانەوەی (لیباسی). نایشوترێ پێخەف‌و رایەخ‌و سەرین لیباس نین ، چونکە لیباس مەعنایەکی زۆر بەرفراوانتری لە دەرپێ یا لە تێکرای جل‌وبەرگ هەیەو خوا لە قورئانا ئەفەرموێ «وهو الذي جعل لكم الليل لباسا[11]» واتە : خوا ئەو خوایە شەوی بۆ کردوون بە پۆشاك (کە ئەوەتە لەناو خۆیا ئەتانشارێتەوەو دەرناکەون).

لەبارەی بەیتی :

**حاجیب‌و حاجی هەموو رۆژێ بەگژ یەکدا دەچوون**
**بێ‌حەیا بوو ئەو سەگە عاری نەبوو ، حاجی بەزی**

(ب ۷ ، ل ١٦٤)یشەوە ، نووسیویە : «لە پەراوێزی ژمارە (٤)ی سەر (عاری نەبوو) ئەمە نووسراوە : لە هەمان دەقدا **(واتە دەق موکریانی)** نووسراوە (عاری هەبوو) کەچی مەبەستی حاجی سەگەو سەگیش دیارە بێ‌حەیایی لێ دەوەشێتەوە . وا راستە بنووسرێ (عاری نەبوو). دیارە چاپەکەی (گ .م) جێی بڕواو متمانەپێ‌کردن نی‌یە ، بەلام ناشێ بە بێ‌بەڵگەی سەلمێندراو رەت بکرێتەوە ، هەروەکوو لێرەدا کراوە ، چونکە تەنیا ئەمە کە (مەبەستی حاجی سەگەو سەگیش بێ‌حەیایی لێ دەوەشێتەوە) بەس نی‌یە بۆ بەهەڵەدانانی (عاری هەبوو)و کردنی بە. (عاری نەبوو). ئەمەو ، بەگوێرەی راستکردنەوەکە ، دووبارەکردنەوەی وەصف روودەداو ، شانازی‌کردنی حاجی بە بەلاغەت‌و فەصاحەتی خۆی‌و زمانی کوردی هەڵدەوەشێتەوە . بۆیە من وای بە باش دەزانم (عاری نەبوو) بکرێ بە (عاری هەبوو)ی چاپی (گ .م)و کۆمایەکەی دوای هەڵبگیرێ‌و لەدوای (سەگە) دابندرێ ، واتە بەم‌جۆرە بنووسرێ : (بێ‌حەیا بوو ئەو سەگە ، عاری هەبوو حاجی بەزی) ، چونکە وەك من تێی‌دەگەم حاجی دەیەوێ بڵێ : دەرگەوانی یارو حاجی هەموو رۆژێ بەگژ یەکدا دەچوون‌و دەبوو بە شەریان . ئەو سەگە ، واتە دەرگەوانی یار ، کردی بە هەراو ، حاجی‌یش (عاری هەبوو)و شەرمی بەخۆ بوو نەبادا سووکایەتی پێ‌بکرێ ، بەزی ، واتە هەلات‌و رای‌کرد . یان ئەو سەگە بێ‌حەیا بوو ، دیارە لە شەریشدا لایەنی بێ‌حەیا سەردەکەوێ – لەبەر ئاشکرایی نەیگوتووە – . حاجی‌یش عاری هەبوو نەیتوانی دیفاع لە خۆی بکاو مەبەستی خۆی بە رێکی دەربڕێ‌و لە شەرەکەدا بەزی ، واتە زێرکەوت‌و شەرەکەی دۆراند . یان حاجی هەرچەند دەیزانی شەرەکە دەدۆرێنێ ، بەلام دیسانیش عاری هەبوو شەرمی بەخۆ بوو دەس‌نەکاتەوە ، بۆیە بەزی ، واتە هەوڵی‌داو تێکۆشا بەڵکو سەرکەوتنێ وەدەس‌بێنێ . (بەزی)ی نیودێری یەکەمی سەرەتای شیعرەکەش بەم‌مانایەی دوایی دێ» .

منیش ئەڵێم : یەکەم وەك بیسراوە (فلان‌کەس عاری نی‌یە) یا (بێ‌عارە) ، من بزانم ، نەبیسراوە بڵێن (عاری هەیە) یا (بەعارە) . بەڵێ لەحاڵێکا کە کەسێك لەوانە بووبێ کارێکی خراپ بکاو پرنگابێتەوەو کشابێتەوە ئەڵێن (عاری هاتەوە) ، ئەمەیش جیایە لە (عاری هەبوو) . لەمەوە ئەگەمە ئەوە کە نوسخەی (عاری نەبوو) بەجێ‌ترو پەسەندترە . مەبەستیشم لەم قسەیە ئەوە نی‌یە بڵێم (عاری هەبوو) هەڵەیە ، چونکە لەوانەیە لە زۆر شوێنیشا وابڵێن‌و من پێی‌نەزانم . لە دەسنووسی مەلا رەئووفیشدا (عاری هەبوو) نووسراوەو لەپاڵیا بە (نوسخە) نووسراوە (نەبوو) ، کەواتە هەردوو تێکستەکە هەن .

بەلام مەعنا لێدانەوە دووەمەکەی کاك فایز کە (بەزی) بەمەعنا «هەوڵی‌داو تێکۆشا بەڵکو سەرکەوتنێ وەدەس‌بێنێ» بێ‌و گوایە «(بەزی)ی نیو دێری یەکەمی سەرەتای شیعرەکەیش بەم مانایەی دوایی دێ» ، ئەوە زۆر دوورو ئەقڵ‌نەبڕیوە . چونکە رێی‌تێ‌ناچێ حاجی ویستبێتی بڵێ لەشەرا لەگەڵ سەگێکی بێ‌حەیای وەك دەرگاوانی بەردەرکی یارا هەوڵم‌دا سەرکەوم ، چونکە بمانەوێ‌و نەمانەوێ مەعناکەی وای

لیّ‌دێته‌وه حاجی خۆی له‌و به‌که‌متر دانه‌نابیّ له دریِ‌و هاریدا ، زیاد له‌وه که (به‌زی) له دێری یه‌که‌می پارچه شیعره‌که‌دا به‌مه‌عنای (دایه غار)ه‌و به هیچ کلۆجیّ پێوه‌ندی به‌م مه‌عنا ده‌س هه‌ڵبه‌سته‌ی کاك فایزه‌وه نی‌یه که له هیچ‌کام له فه‌رهه‌نگه کوردی‌یه‌کانی به‌رده‌ستمانا تارماییشی دیار نی‌یه چونکه له که‌س نه‌بیسراوه‌و زمانیش ئه‌بیّ زمانی میلله‌ت بیّ .

له‌باره‌ی به‌یتی :

**ده‌فعه‌یه‌ك ئیمتیحانیان ناکه‌ن**

**تیّ‌بگه‌ن زه‌هره یا نه تریاکن**

(ب ٦ ، ل ١٨٥) یشه‌وه ، نووسیویه : «واباشه نیودێری دووه‌م به‌م‌جۆره بنووسریّ (تیّ‌بگه‌ن زه‌هر یا نه تریاکن) ، واته بزوێنی (ه)ی (زه‌هره) بسرێته‌وه ، سووکه بزوێنی (i) که هێشتا له ڕێنووسی کوردیدا نیشانه‌ی بۆ دانه‌ندراوه ، بخرێته سه‌ر (هـ)یّ‌یه‌که . ئه‌مه‌ش بۆئه‌وه‌ی له کێشه‌ی وه‌ك یه‌ك نه‌بوونی (ئیمتیحانیان)و (زه‌هره) له کۆیێتی (الجمعیة)دا ، ده‌رباز ببین» .

منیش ئه‌ڵێم له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌یش که بۆچوونه‌که‌ی کاك فایز وردو خوێنده‌وارانه‌یه ، مه‌سه‌له‌که ته‌نها له (واباشه)دا نی‌یه . جاریّ ئه‌وه هه‌موو هاوده‌نگین له‌وه‌دا که (زه‌هره) هه‌ڵه‌یه چونکه (ه) ضه‌میری موفره‌ده‌و مه‌رجه‌عیش لێره‌دا جه‌معه‌و پاشتریش هه‌ر ضه‌میری جه‌مع له (تریاکن)دا به‌کارهێنراوه . منیش ، پێی لیّ‌ئه‌نێم ، به‌رپرسم که بۆچی له کاتی له‌چاپدانی کتێبه‌که‌دا جارێکم بۆ ئه‌م هه‌ڵه‌یه نه‌دۆزیوه‌ته‌وه . که‌واته ئه‌بیّ یا (زه‌هرن) بیّ یا (زه‌هر) . دیاره (زه‌هرن) نی‌یه چونکه نیوه به‌یته‌که‌ی زۆر پیّ له‌نگ ئه‌بیّ . نایشکریّ ، وه‌ك کاك فایز پێشنیای کردووه ، سووکه بزوێنی (i) ، یا وه‌ك من ئه‌ڵێم (ژێره‌به‌کی به‌دزی‌یه‌وه) ، بدریّ به (هـ)ی (زه‌هر) چونکه بمانه‌ویّ‌و نه‌مانه‌ویّ ئه‌یکا به (زه‌هیر) ، به‌لاّم ئه‌گه‌ر ئیشباعێك به زه‌نه‌ی (ر)که‌ی (زه‌هر) بدریّ ، چارێکی له‌نگیی نیوه به‌یته‌که ئه‌کا . ئیستایش که ئه‌م چه‌ند دێره ئه‌نووسم وای‌بۆئه‌چم له‌ئه‌سڵدا (زه‌هرو) بووبیّ‌و به هه‌ڵه‌ی نوسخه‌گره‌وه (نساخ) کرابیّ به (زه‌هره) . ئه‌م (زه‌هرو)ه‌ویش سووك‌کراوه‌ی (زه‌هر وه) بیّ که له‌گه‌ڵ (یا نه)که‌ی پاشه‌وه‌ی زۆر باش ئه‌گونجیّ . ئه‌وه‌یش بڵێم که له هه‌ردوو ده‌سنووسی مه‌لا ڕه‌ئووف‌و مسته‌فا سائیبدا (زه‌هره) نووسراوه .

له‌باره‌ی به‌یتی :

**تۆ وه‌ره فه‌ننی فێر به چیته له‌وه**

**گاوره . هیندووه . وه‌یاخۆ جووه**

(ب ٢ ، ل ١٨٧)یشه‌وه . نووسیویه : «نیشانه‌ی (٧)ی سه‌ر (ی)ی (فه‌ننیّ) کردوویه به (ی)ی ته‌نکیر . واته : وه‌ره فێری فه‌ننێك به هه‌ر فه‌ننێك بیّ . دیاره ئه‌مه‌ش مه‌به‌ستی حاجی نی‌یه ، چونکه فه‌ن نه گاوره نه هیندووه . نه جووه . بۆیه ده‌بیّ ()ه‌که بسرێته‌وه تا (ی)یه‌که ببێته ڕاناوی که‌سی سیّ‌یه‌م‌و بگێردرێته‌وه بۆ (چین – صین)ی نێو حه‌دیثه‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر (د.خ)» .

منیش ئه‌ڵێم : به‌ش‌به‌حاڵی نیشانه‌ی ()ی سه‌ر (ی)ی (فه‌ننیّ) هه‌ڵه‌ی چاپه . به‌لاّم ضه‌میری (ی)ی (فه‌ننی) ناگه‌ڕێته‌وه بۆ چین . بۆ مه‌رجه‌عێکی ته‌قدیری ئه‌گه‌ڕێته‌وه که نیوه‌به‌یتی دووه‌م ڕوونی‌ئه‌کاته‌وه . واته : تۆ وه‌ره فێری فه‌ننی خاوه‌ن‌فه‌ن به . چیته له‌وه که ئه‌و خاوه‌ن‌فه‌ننه گاوره یان جووله‌که‌یه یان هیندۆکه .

له‌باره‌ی به‌یتی :

**به‌یتی من چونکه که‌ڵکیان ده‌گریّ**

**لــه غه‌ریبی‌و بیّ‌که‌سی ده‌مریّ**

(ب ٤ ، ل ١٩٠) یشه‌وه . نووسیویه : «ڕێنووسی کوردیی سه‌رده‌می حاجی ڕێگه‌مان ده‌دا که نیودێری یه‌که‌م به‌م‌جۆره بخوێنینه‌وه : (به‌یتی من چونکه کلکیان ده‌گریّ) . وابزانم ئه‌مه‌ش له هی نێو دیوانه‌که باشتره . چونکه (کلکیان) ڕاسته‌وخۆ زه‌مه‌و ، له‌گه‌ڵ (به‌یتی مه‌دداحیان)ی پێش خۆی‌و (له‌ژێر باری ڕۆمی‌یان)ی دوای خۆی گونجاوتره» .

منیش ئەڵێم : وانی‌یە ، چونکە ئەگەر حاجی ئەوکەسانە بە کلکدار بزانێ ، چۆن ئەبێ بەتەمای ئەوە بێ قسەی بچێ بەگوێ‌یانا ؟

ئەنجا کەسی شێوەی ئامۆژگاری‌و خستنە سەر رێی راست ئەوەیە قسەی سووك بە ئامۆژگاری‌کراوەکە بڵێت ؟ ئەمە بە هیچ کلۆجێ نە لەگەڵ ئادابی ئیسلامەتی‌و نە لەگەڵ رێ‌وشوێنی مرۆڤایەتی ناگونجێ . سەرەرای ئەمەیش لە هەردوو دەسنووسی مەلا رەئووف‌و مستەفا سائیبدا (کەڵکیان) نووسراوە .

لەبارەی بەیتی :

**مەسجیدو میحراب‌و مینبەر بێ‌کەسە**

**هەر مەپرسە حاڵی چۆنە مەدرەسە**

(ب ٢ ، ل ٢٠٢)یشەوە ، نووسیویە : «لە پەراوێزێ لەسەر ئەم بەیتە ئەمە نووسراوە : (ئەم بەیتە لە دەسنووسێکی لای مندا هەبوو - محمدی مەلا کریم) کەچی هەر ئەم بەیتە بە بێ هیچ جیاوازی‌یەك لە چاپەکەی (گ .م)یشدا هەیە ؟ !» .

منیش ئەڵێم : من بەراوردی تێکستەکەی شارەزاو میرانم لەگەڵ دەسنووسەکانی لای خۆم‌و ئەو رۆژنامەو گۆڤارە کۆنانەی بەغداو ئەستەموول کردووە کە لام‌بوون . نەك لەگەڵ چاپی مامۆستا گیوو کەسانی تر .

لەبارەی بەیتی :

**شەیخەنا گەر ئەم قسەت نایێتە گوێ**

**سەیری وا چۆڵە کەری تێدا بگێ**

(ب ٣ ، ل ٢٠٢)یشەوە ، نووسیویە : «بۆ رێکیی کێش‌و سەرواو بۆئەوەی لە شێوە ئاخاوتنی کۆیەی سەردەمی حاجی نزیك بێتەوە ، واباشە (نایێتە گێ) بنووسرێ» .

منیش ئەڵێم : لە رووی سەنگ‌و قافیەوە (گێ)و (گوێ) ئەوەندە فەرقیان نی‌یە چاوپۆشیی لێ نەکرێ . سەرەرای ئەوە ئەگەر بە (گوێ) نووسرا کۆیی رێی ئەوەیان لێ ناگیرێ بە (گێ)ی بخوێننەوەو خەڵکی شوێنانی‌تریش بە (گوێ) ، بەڵام ئەگەر بکرێ بە (گێ) لەوانەیە زۆرکەسی خەڵکی شوێنانی‌تر نەزانن وشەکە چۆنەو مەعنای چی‌یە .

وەك منیش بزانم کۆیی ئیستایش لەجیاتیی (گوێ) هەر (گێ) ئەڵێن مەگەر لە کۆیە دوورکەوتبنەوەو زمانی شوێنانی‌تریان هەڵگرتبێ . لە دەسنووسی مەلا رەئووف سەلیم ئاغای حەوێزیی کۆیی‌و مستەفا سائیبیشدا هەر (گوێ) نووسراوە .

لەبارەی بەیتی :

**سەیری ناکەن طائیفەی ئەو شێخەکان**

**وەك صـــەحابەو عادەتی پێشینیان**

(ب ٥ ، ل ٢٠٣)یشەوە ، نووسیویە : «لە پەراوێزێك لەسەر (ئەو شێخەکان) ئەمە نووسراوە :(لە زۆربەی سەرچاوەکاندا لەجیاتیی دوا وشەی ئەم نیو دێرە چەند خاڵێ دانراوە) . دیارە جێ پرکردنەوەی خاڵ کارێکی پەسەندە ، بەڵام پێویستیشە پەنجە بۆ ئەو تێکستە درێژ بکرێ کە پشتی پێ بەستراوە بەتایبەتی ئەگەر دەربرینەکە لاواز بێ .

جا ئەگەر (ئەو شێخەکان) بە پاڵپشتی تێکستێك داندرابێ ، ئەوا لەوانەیە (نەوشێخەکان - نۆشێخەکان) بووبێ ، چونکە شێخەکان زیاتر لە سەرەتای شێخایەتی‌یان بەوجۆرەی کە حاجی وەسفی کردوون دەگەران تا تەکیەو خانەقایان دروست دەکرد ، ئینجا خۆیان دادەنیشتن خەڵك بە خۆیان دەهاتنە لایان . خۆ ئەگەر پرکردنەوەکە لەخۆوە بێ ، ئەوا دانانی وشەی (دەروێشەکان) بە باشتر دەزانم چونکە وەسفەکەی حاجی لەگەڵ هەموو قۆناخەکانی دەروێشی دەگونجێ» .

منیش ئەڵێم : یەکەم دانانی وشەی (ئەو شێخەکان) بەگوێرەی دەسنووسی مەلا رەئووفی حەوێزی‌یەو لەخۆوە نی‌یە . شارەزاو میرانیش لە سەرەتای دیوانەکەدا روونیان کردووەتە کە پشتیان بە دەسنووسی مەلا رەئووف بەستووە . دووەم ئەم دوو وشەی (ئەو شێخەکان)ە بە شێوە نووسینی کۆن وەك ئیستە نەنووسراوە تا بڵێین لەوانەیە (نەوشێخەکان) بوو بێ گۆرابێ . پێشان (ئەو شێخەکان) بە (او شیخکان)و (نەوشێخەکان) بە (نوشیخکان) نووسراوەو زۆر دوورە کەسێ (او) بە (نو)

بخوێنێتەوە . سێهەمیش ئەم بۆچوونەی کاك فایز لەبارەی سەرەتاو گەشەکردنی شێخیەتی هەر بنەماڵەیەکی شێخانەوە بەتەواوی لەگەڵ ڕەوتی گەشەکردنی ڕاستی‌یاندا جیاوازە . شێخان تێکرا لە سەرەتادا پیاوی خواپەرستو خزمەتگوزار بوونو نەگەڕاونو لە شوێنی خۆیانا دانیشتوونو بەوجۆرە تەکیەو خانەقایان دروست کردووەو خەڵکیش هاتوونەتە لایان . جا پاشان کە سەردەمێکی تارادەیەك زۆر بەسەر بنەماڵەکانیانا تێپەڕیوە وردە وردە بوون بە دەرەبەگ‌و پیاوی دنیاو پێوەندیان لەگەڵ حوکمڕانان بەستووە . کەواتە تێکرا (تازە شێخ) لە خواوە نزیکترو لە خراپەوە دوورترە تا (کۆنە شێخ)و حاجی قادر لە هێرشیا بۆ سەر شێخان مەبەستی لەو شێخانە بووە کە لە ڕێگای خوا لایانداوەو گۆڕیویانەتەوە بە ڕێگای دنیاداری .

بەش‌بەحاڵی ئەوەیش کە کاك فایز پێشنیا ئەکا لەجیاتی (ئەو شێخەکان) وشەی (دەروێشەکان) دابنرێ . ئەوەم وەك ماڵی بێخاوەن دابەشکردن دێتە پێش چاو . عەبدوررەززاق بیمار وای پێ‌باش‌بوو (ئەرمینیان) یا (ئێرانی‌یان) بێ . مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی‌یش (حوسەینی‌یان)ی لا پەسەند بوو : ئەمەیش کاك فایز بە بۆچوونێکی تازەی خۆیەوە دۆڵچەی خۆی داهێشت . بەڵێ ڕاستە لەوانەیە (ئەو شێخەکان) لەم‌شوێنەدا بە دوو وشەی بێ‌جێ بێنە پێش چاو ، بەڵام بە ڕەچاوگرتنی پێوەندی لەگەڵ سێ نیوەدێڕی پاشەوەدا جێگا بۆ خۆشکردنی زۆر زەحمەت نابێ‌و ، بە هەرحاڵ ئێمە ئێستا لە حاڵێکا کە کۆمەڵە نوسخەیەکی باوەڕپێ‌کراومان لە بەردەستا نی‌یە بتوانین تێکرای شیعری حاجی قادر ساغ‌کەینەوە ، نابێ خۆمان لەجیاتی ئەو بکەین بە خاوەن‌شیعر بەڵکو ، پێویستە هەوڵی دەسخستنی دەستنووسی‌تری کۆن بدەین‌و بیربکەینەوەو چاوەڕوان بین ، خۆ ناتمان بە تەنوورەوە نەسووتاوە .

لەدواییشدا ئەوەیشتان لێ نەشارمەوە کە تێ‌نەگەیشتم مەبەستی کاك فایز چی‌یە لەوە کە ئەڵێ : «چونکە وەسفەکەی حاجی لەگەڵ هەموو قۆناخەکانی دەروێشی ئەگونجێ» لەبەرئەوە کە ئەهلی تەصەوف - ئەگەر مەبەستی کاك فایز لە دەروێشی تەصەوف بێ – لە هەموو قۆناغەکانی بوونیانا وانەبوون کە حاجی لەو چەند بەیتەدا باسی هەندێ لە شێخان ئەکا . ئەهلی تەصەوف لە گەڵێ لە قۆناغەکانی بوونو بیریانا ڕوویەکی گەشی ژیان بوونو لە زۆر ڕووەوە وەك ئەستێرە بە ئاسمانی بیری موسوڵمانی‌یەوە ئەدرەوشێنەوەو . جیاوازی‌یەکی زۆر لەنێوان سۆفی‌یە ڕاستەقینەکانو ئەو کەرتە شیخە عەوام هەڵفریوێن‌و دەسبڕانەدا هەیە کە سۆفی‌یەتی‌یان کردووە بە پرد بۆ گەیشتن بە مەبەستی نارەوای ڕووتاندنەوەی خەڵکی ساویلکەو ڕەش‌وڕووت .

لەبارەی بەیتی :

**ڕووتو پێ‌خاوس بە زەرگێك‌و مەتاڵ**

**باوکی بۆ دوو پوول دەردێنێ لە چاڵ**

(ب ٦ ، ل ٢٠٣)یشەوە . نووسیویە : «بۆ سواریی کێشی‌و بۆ پاراستنی شێوە ئاخاوتنی کۆیەی سەردەمی حاجی . واباشە (پوولی) بنووسرێ» .

منیش ئەڵێم : بۆچوونەکەی کاك فایز باشەو شێوە نووسینی کۆنی کوردی‌یش ڕێی ئەوەمان ئەدا .

لەبارەی بەیتی :

**گوڵشەنی پڕ میوەیی باغی مەعاد**

**وا لەژێــــری سایەیی تیغی جیهاد**

(ب ٩ ، ل ٢٠٣)یشەوە ، نووسیویە : «دەبوایە دواوشەی نیودێڕی یەکەم بەم‌جۆرە بنووسرابا : (میعاد) تا ببێتە هاوکێشی (جیهاد) . دیارە ڕێنووسی کۆنو ناوەرۆکیش ڕێگەمان ، دەدەن» .

منیش ئەڵێم : یەکەم بەگوێرەی زانستی عەرووز مەرج نی‌یە دوو وشەی دوایی لە دوو نیوە دێڕی بەیتا لە سەروژێریشا وەك یەك بن . دووەمیش لەوانەیە کە (مەعاد)مان کرد بە (میعاد) ژێری میمەکە کە کردوومانە بە (ی) . بە (ی)ی درێژ بخوێنرێتەوە وەك لە (میعاد)ی بەمەعنا (مەوعید)داو هەم

سەنگیش‌و هەم مەعنایش تێك‌بچێ. ئەمەیش گشتی سەرەرای ئەوە کە وشەکە (مەعاد)ەو، خوا لە قورئانا ئەفەرموێ: «ان الذي فرض عليك القران لرادك الى معاد[12]». وشەی (معاد) - کە (م)ەکەی ژێری بێ، لە زمانی عەرەبیدا نی‌یە.

لەبارەی بەیتی:

**ئەو زەمانی بوونە ئاردی نێو درك**
**پارەیەك ناکا دوصەد جار بێتە رك**

(ب ١، ل ٢٠٧)یشەوە، نووسیویە: «دەبێ (بێنە رك) بێ تا لەگەڵ (بوونە)ی نیودێری یەکەم لە کۆیێتی (الجمعیة)دا بگونجێ».

منیش ئەڵێم: مامۆستا مەلا جەمیلی رۆژبەیانی‌یش رای هەروەك رای کاك فایزەو منیش لە وەڵامدانە وەکەیا بۆم مۆر کردووە، بەڵام ئێستا لام‌وایە هەمووومان بەهەڵەچووین‌و راستەکەی هەر (بێتە رك)ەو، لە دەسنووسەکەی مەلا رەئووفیشدا (بێتە رەك)ە.

بەڵگەی ئەم بۆچوونەی ئێستایشم ئەوەیە ضەمیری موفرەدی غائیبی ناو فیعلی (بێتە) بۆ ئەو مەرجەعە ئەگەرێتەوە کە ضەمیری موفرەدی غائیبی ناو فیعلی (دەیدا)ی بۆ ئەگەرێتەوە لە رستەی (دەیدا بەشوو)ی بەیتی پێشوودا. لام‌وایە (رك)یش لێرەدا بەو مەعنایە نی‌یە کە مامۆستا مەلاجەمیل نووسیویە کە پەتێکی فرەئەڵقە بێ بۆ بەستنەوەی کارو بەرخی ساوا، (رك)ی بەمەعنا (رق)ەو مەعنای تێکرای بەیتەکە وای لێ‌دێتەوە: جا کە باوك‌و کچی بەشوودراو لێك جوێ‌بوونەوەو هەریەکە کەوتە لایەك‌و وەك ئاردی نێودرکیان لێ‌هات کە کۆکردنەوەیان بۆ کەس هەڵنەسوورێ، ئەوجەلە باوك سەد جاریش رقی هەستێ‌و لە کردەی خۆی لە بەشوودانی کچەکەیا پەشیمان بێ کەڵکی نی‌یەو پوولێ ناکا. ئەمە ئەمە. لەگەڵ ئەمەیشا پارچە شیعرەکە تێکرا پرە لە گیروگرفتی ئێستا لەچارەنەهاتوو، بۆیە هەر ئەبێ چاوەروان بین تا نوسخەیەکی راست‌و خاوێن لە کونێکەوە سەر هەڵ‌ئەدا.

لەبارەی بەیتی:

**شەهسەوارن، پیادەیان ئازان**
**بەردی نیشان‌و کۆلکی مەیدان**

(ب ٥، ل ٢١١)یشەوە، نووسیویە: «(کۆلکی مەیدان) لە بن‌پێی سواران پێ‌شێل ئەکرێ‌و ئەهاردرێ. لەوانەیە لە جێی خۆیا (کۆڵەگەی مەیدان) بووبێ».

منیش ئەڵێم: لە دەسنووسەکەی مەلا رەئووفیشدا بەم‌جۆرە نووسراوە: (بردنیشیان وەکو لکی میدان). من لەبەرئەوەی کە مەعنای نیوە بەیتەکەم بۆ ساغ‌نەبوەوە هیچ دەسکاری‌یەکی تێکستەکەی شارەزاو میرانم نەکرد. ئێستایش ئەمەی کاك فایز بۆی‌چووە بۆچوونێکی نوێ‌یە ئەیخەینە پاڵ بۆچوونەکانی‌تر تا بەیتەکە بەتەواوی ساغ ئەکرێتەوە.

لەبارەی بەیتی:

**لە کون‌و قوژبنی کەلاوەی دەهر**
**چەندی‌تر هەن میسالی گەنجی گوهەر**

(ب ٤، ل ٢٢٠)یشەوە، نووسیویە: «بە بروای من تەگەرەی نارێکیی سەروای دوو نیودێرەکە کە مامۆستا شارەزا لە (ساغ‌کردنەوەی هەندێ گیروگرفتی شیعرەکانی حاجی‌قادری کۆیی)دا پەنجەی بۆ راکێشاوە، لەئەنجامی بەهەڵە خوێندنەوەوە هاتووە. لەوانەیە نیودێری یەکەم بە رێنووسی کۆن بەم‌جۆرە نووسرابێ: (لە کن قزبن کلاوی دەهر) کە بە رێنووسی ئێستا ئاوا دەنووسرێ: (لە کون‌و قوژبنی کەلاوەی دیهـ هەر). دیارە (هـ)ی (دیهـ) لە ناچاریی نەبوونی نیشانەیّ (ی)ی کراوەو، نارێکیی نووسینی وشەی بە یەك پیت هاتووە. هەر لەبەر ئەو نارێکی‌یەیە کە زۆر جار دەبینین لە دەسنووسی کۆن لەجیاتیی (چ‌دەکەی)و (چ‌دەڵێی) نووسراوە (چە دەکەی، چە دەڵێی).

کەواتە واباشە بەیتەکە بەم‌جۆرە بنووسرێتەوە:

لە کون‌و قوژبنی کەلاوەی دێ، هەر
چەندی‌تر هەن میسالی گەنجی گوهەر.

واتە : هەر لە کوّن‌و قوژبنی کەلاوەی دیّ چەند شاعیری‌تر هەن میسالی گەنجی گوهەر ، هەرچەند لەم خویّندنەوە تازەیەشدا (تەعقیدی مەعنەوی)[١٣] هەیە ، بەلاّم چوّنی هەبیّ لە ناریّکیی سەروا باشترە ، چونکە ناریّکیی سەروا سیفەتی شیعریەتی لیّ دادەرنیّ . ئەمەو ، (کوّن‌و قوژبنی کەلاوە) لەگەلّ (دیّ) دەگونجیّ نەك (دەهر)» .

منیش ئەلّیم : بەراستی ئەم بوّچوونەی کاك فایز بوّچوونیّکی سەیرو سەمەرەیە . ئەو لەکاتیّکا کە شیّوە نووسینی بەیتەکە ئەباتەوە سەر شیّوە نووسینی کوّنی فارسی‌و عەرەبی ، هەر بوّئەوەی ریّ بوّ بوّچوونەکەی خوّی بکاتەوە ، ئەنووسیّ لەوانەیە لەئەسلاّ بەم‌جوّرە بووبیّ (لە کن قزبن کلاوی دە هر)[١٤] ، وشەی (دهر)ی بە هەزار پشت عەرەبی بە شیّوە نووسینی نویّی کوردی ئەنووسیّ‌و ئەیکا بە (دەهر) تا بتوانیّ بلّیّ لەئەسلاّ (دە ، هر) بووە واتە (دیّ ، هەر) . ئەنجا ئەو لەکاتیّکا کە قایل نابیّ (مەعاد)و (جیهاد) هاوسەنگ بن ، دیّ (دیّ ، هەر) مان لەگەلّ (گوهەر) بوّ بە هاوتای یەك دائەنیّ . لەکاتیّکیشا کە گریّیەکی (هـ)ی (دەهر)ی بوّ قووت‌ناچیّ‌و لە ناریّکیی قافیە ئەکەویّتە هاوارو فوغان ، هەست بە قورسیی برگّەیەکی زل‌و زەبەللاحی وەك ـ(دیّ) ناکا کە ئەگەر هەر بەیەکجاری نەبیّ ئەوکاتە نیوە بەیتەکە بەتەواوی ریّك ئەبیّ ! !

لەبەر هەموو ئەم هوّیانە ئەلّیم بوّچوونەکەی کاك فایز هیچ لەجیّی خوّیا نی‌یەو ، نیوەبەیتەکە ئەگەر ئیّستا چەردەیەك قورسیی تیابیّ ، بەوپیّ‌یە کە ئەو پیّی‌باشە ،بەتەواوی لەنگ ئەبیّ . ئیّمە ئیّستا بە نیمچە بەزوّر لیّوەوە کردنیّکی (هـ)کەی (دەهر) نیوە بەیتەکە بەتەواوی دیّنینە ژیّر بار ، بەلاّم کە وامان‌لیّ‌کرد کە کاك فایز پیّشنیای ئەکا ، خوّمان بەتەواوی ئەکەوینە ژیّر باری‌و ئەخنکیّین . ئەنجا (کەلاوەی دەهر) لەرووی مەعناوە چ‌ناپەسەندی‌یەکی تیایە ؟ (کەلاوەی دەهر) ئیستیعارەیەکی زوّر وردو بالاّی تیایە لەکاتیّکا کە (کەلاوەی دیّ) قسەیەکی زوّر رەمەکی‌و بیّ‌دیمەن‌و سادەو ناشاعیرانەیەو ، مەعنایەکی ئەوتوّیش نابەخشیّ . ئەگینا شاعیر چی ئەکا لە کوّن‌و قوژبنی کەلاوەی دیّدا ؟ مارە ، مشکە ، دوویشکە ، میّروولەیە ، چی‌یە ؟ کەلاوەی دیّ کەی گەنج‌و گەوهەری لەژیّردا بووە ؟ کەی لە هەندیّ خەرەکە شکاوی بنیادەم‌و قشپلی تاژەلّ‌و خوّلّەکەوەی ئاگردانیّ بەولاوەی تیا دوّزراوەتەوە ؟ هەرچی (کەلاوەی دەهر)ە بەمەعنای گوّشەو کەناری گەردوون‌و میّژوو تەعبیریّکی زوّر جوان‌و هونەرمەندانەیەو ، لەسەر بنەمای شوبهاندنی گەردوون لەکوّنیدا بە کوّنە شارەکانی وەك نینەواو ئەکباتان‌و بیّستوون‌و بابل‌و ئوورو حەزەر دامەزراوە کە ئەوەندە دیّرینە بیّ بووبیّ بە کەلاوەی پر لە کوّن‌و قوژبن . لە هەموو ئەمەیش بەولاوە ئەگەر (کەلاوەی دیّ ، هەر) بیّ ، ئەبیّ ئەو (هەر)ە لەم شویّنەدا ، مەلایان واتەنی ، مەحەللی چی بیّ لە ئیعرابا ؟ خوّزگە کاك فایز ، بیّ‌زەحمەت ، لە وتاریّکی‌تردا بوّی روّشن ئەکردینەوە .

لەبارەی بەیتی :

**شیعریان جوانە ، بەس نی‌یە کوردن**

**گـــەرچی بەدناون‌و گەلیّ وردن**

(ب ٧ ، ل ٢٢٠)یشەوە ، نووسیویە : «ئەم واوەی نیّوان (بەدناون)و (گەلیّ)ی نیودیّری دووەم هەلّەیە ، چونکە (گەر) پیّویستی بە وەلاّم هەیە . جا ئەگەر واوەکە هەلّە نەبیّ ، دەبیّ بە (فیدایان دەکەم)ی بەیتی دوای وەلاّمی (گەر) بیّ ، ئەمەش مەبەستی حاجی نی‌یە ، چونکە حاجی دەیەویّ بلّیّ : گەرچی ئەم سیّ شاعیرە ناویان ناشیرین‌و سەیرە ، بەلاّم بیریان وردو مووقەلّیّشە» .

منیش ئەلّیم : وانی‌یە ، چونکە نیوەی دووەمی ئەم بەیتە بە هیچ کلوّجیّ بوّ شەرت‌و جەزا دەس‌ناداو ، (گەرچی)یش پیّویستی بە وەلاّم نی‌یە ، بەمەعنای (هەرچەند)ی کوردی ، یا (وان)ی غانی‌یەی عەرەبی‌یەو ، مەبەستیش لە (ورد) بیّ‌بایەخیّ کوّمەلاّیەتی‌یە ، وەك بەناوی شاعیرەکان خوّیشیانا دەرئەکەویّ کە ئەم بەیتە باسیان ئەکاو لە بەیتی پیّشوودا ناویان هیّنراوە :

(مەلکەقوڕ)و (حیماری)و (کیسەشکەل)
قـــس من اسمائهم ولانسأل)

خۆ ئەگەر هەر بیشڵێین (گەرچی) ئەداتی شەرتە بەمەعنای (ان الشرطیة)ی عەرەبی ، ئەڵێین شەرتەکە کەوتووەتە دواوەو وەڵامی شەرتەکە لە نیوەبەیتی پێشوودایەو ، زۆرجار وائەبێ وەڵامی شەرت ئەکەوێتە پێش ئەدات‌و فیعلی شەرتەوە .

لەبارەی بەیتی :

**(سلام الله منی کل یوم)**
**لە ئەصحابانی صاحێب غیرەت‌و دین**

(ب ١ ، ل ٢٣٠)یشەوە ، نووسیویە : «وا باش‌بوو تەنوینی سەر (م)ی (یوم) بە ڕێنووسی کوردی بنووسرابایە (یوم)(ین) ، چونکە زوربەی زۆری خوێندەواری کورد ، بگرە عەرەبیش ، فێری خوێندنەوەی تەنوین نین‌و پێی ڕانەهاتوون‌و ، لەوانەیە بڕیاری نارەواو ناتەواوی بەیتەکەو سەرروای بدەن» .

منیش ئەڵێم : ئەوە پەسەند نی‌یەو ڕاست ئەوەیە یا هەموو ڕستە عەرەبی‌یەکە بە شێوە نووسینی کوردی بنووسرێ ، یا هەمووی بە عەرەبی بنووسرێ‌و خوێندەواری کوردیش تێکرا عەرەبی ئەزانێ . ئێمە تێکرا لە دیوانی حاجی‌قادرا وامان پێ باش‌بووە ڕستەی عەرەبی هەر بە عەرەبی بنووسین .

لەبارەی بەیتی :

**یا لەگەڵ فارســـی چ‌فەرق هەیە**
**بۆچی ئەو ڕاستە ، بۆچی ئەم کەچەیە ؟**

(ب ١ ، ل ٢٤١)یشەوە ، نووسیویە : «دیارە چاپی تازە بەنیازی چارکردنی کێشەی نارێکیی سەرروای بەیتەکە لەجیاتیی (کەمی‌یە)ی چاپی سێیەم (کەچەیە)ی داناوە . ئەم گۆڕینە ئەگەرچی دەربازی کردووین لە کێشەی نارێکیی سەروا ، بەڵام ، وەك هەستی پێ دەکەم ، تووشی کێشەیەکی قووڵتری کردووین کە کێشەی ناوەڕۆك‌و ڕێزمانەو لێ دەربازبوونی زەحمەتە ، چونکە (کەچەیە)ی چاپی تازە ئەگەر بەمانای (کەچە) واتە (شتی کۆن‌و خراپ‌و بێ‌کەلك) بێ ، ئەوا لەبارەی ڕێزمانەوە تەواوە ، بەس لەبارەی ماناوە نارێکە ، چونکە (کەچەیە)ی بەومانایە بەرانبەرەکەی (باشە)و (چاکە)یە نەك (ڕاستە) . ئەگەر بەمانای (کەچ) واتە (خوار ، لار)یش بێ ئەوا لەبارەی ناوەڕۆکەوە تەواوە ، بەڵام لەگەڵ (کوردواتەنی)یەوە ناگونجێ‌و دەبێ بگوترێ : (بۆچی ئەو ڕاستە ، بۆچی ئەم کەچە) . ئەمەو ، دیارنەکردنی تێکستی پشت‌پێ‌بەستراو نیشانەی پرسیاری دوای (کەچەیە) تۆختر دەکا . جا بۆ چارکردنی کێشەکە من وای بە باش دەزانم ڕستەی دووەمی نیودێری دووەمی چاپی (گ . ك) کە بە ڕێنووسی کۆنی کوردی بەم‌جۆرە دەنووسرێ : (بوچ ام کمیه) ئاوا بخوێندرێتەوە : بۆچ ئەم گەمەیە) . دیارە ئەم خوێندنەوەیەش بۆ کێش‌و سەروای بەیتەکە باشەو ، لە دەقە چاپکراوەکانی پێش چاپی تازەش دوور ناکەوێتەوە . لەبارەی ماناو ناوەڕۆکیشەوە (گەمە – گاڵتە ، فشە) بەرانبەر (ڕاست)ی بەمانای (موجید – الجد)ە .

منیش ئەڵێم : لێکدانەوەکەی کاك فایز بەجێ‌یەو ، لە دەسنووسی مەلا ڕەئووفیشدا (گمەیە) نووسراوەو بە نوسخەیش نووسراوە (کچەیە) کە ئەبێ بە (کەچەیە) . کەواتە نیوەبەیتەکە بەم‌جۆرە ڕاست ئەکەینەوە : (بۆچی ئەو ڕاستە ، بۆچی ئەم گەمەیە) . بوونی وشەی (کمیە – کەمی‌یە) یش لە هەندێ نوسخەدا نیشانەی ڕاستیی دەسنووسەکەی مەلا ڕەئووف‌و بۆچوونەکەی کاك فایزە ، چونکە نە (کەمی‌یە)و نە (کەمە) بۆ ئەم شوێنەو لە بەرانبەر (ڕاستە)دا دەست‌نادا . لە شێوە نووسینی کۆنیشدا زۆر جار (گ) بە (ك) نووسراوە . کەواتە (کمیە)ی کۆن (گمیە)یە کە بە شێوە نووسینی نوێ ئەبێ بە (گەمەیە) . مەبەستیش لەم (گەمە)یە بەرپەرچدانەوەی بۆچوونێکی کۆنەپەرستانەی هەندێ کەسە کە بەکوردی نووسینیان لە بەرانبەر بە فارسی‌و تورکی‌و عەرەبی نووسینی کۆندا بە گاڵتەی منالأن دائەنا . من خۆیشم لە سەرەتای فەقێ‌یەتیا تووشی‌کەسانی‌وا بووم بەوچەشنەیان بیرئەکردەوە .

لەبارەی بەیتی :

**لە بەرپێـــم درکو دارو شاخو باری**

**وەکوو مەخمەر بوو نەرمی ، یا نە قاری**

(ب ٤ ، ل ٢٤٦)یشەوە ، نووسیویە : «لە پەراوێزدا نووسراوە» : (ئەم قالّی)یە بۆ هاوسەنگی بە شێوەی کۆیە (قاری) دەخوێنرێتەوە . دەبوایە ئەم (قاری)یەی شێوەی کۆیە بخرابایە نێو دەقی بەیتەکە ، چونکە هەمووکەس ماندووبوونی خوێندنەوەی پەراوێزان ناداتە بەر خۆیو لەوانەیە بڕیاری لاوازیی سەروای بەیتەکە بدەن . ئەمەو ، لە شێوەی ئاخاوتنی کۆیەی سەردەمی حاجی بەدوور نازانم کە (باری)ی دوا وشەی نیو دێری یەکەم لەجێی خۆی بە مەبەستی (یاری – یالّی ، یالّ) نووسرابێ‌و ، لەئەنجامی بچووکیی نوقتەی (ی)کە بەهەڵە بە (باری) خوێندرابێتەوە . جا ئەگەر ئەوەمان لێ بسەلمێندرێ ، نیودێری یەکەم بەمجۆرە دەنووسین : (لە بەرپێم درکو داری شاخو یاری)» .

منیش ئەڵێم : بەش‌بەحاڵی بەشی یەکەمی بۆچوونەکەی کاک فایز منیش هەر لاموایەو کاتی خۆیشی ویستم بە (قاری)ی بنووسمەوە بەتایبەتی کە (درکو دار)یش هەر (درکو دالّ)ەکەی دیالێکتی سولەیمانی‌یەو (شاخو باری)یەکەیش یا (شاخو بالّی)یە یا (شاخو یالّی) ، بەلاّم سەلامەتبێ کاک کەریم شارەزا ڕێگای نەدامو هەر وای هێشتەوە . بەش‌بەحاڵی بۆچوونی دووەمیشی ، لە دەسنووسەکەی مەلا ڕەئووفیشا ، وەك ئەو بۆی‌چووە ، (یاری) نووسراوە کە لە دیالێکتی سولەیمانیدا ئەبێ بە (یالّی) ، بەلاّم ئەوەی ناچاری تۆزێ ڕامانمان ئەکا ئەوەیە (شاخو بالّ) پێکەوە لە ئیدیۆمدا بەکاردێ ، بەلاّم (شاخو یالّ) نەبیستراوە ، چونکە ئەوەی شاخی بێ یالّی نی‌یەو ئەوەی یالّی بێ شاخی نی‌یە .

لەبارەی ڕوونکردنەوەی شوێنی ئەو ناوانەیشەوە کە لە چەند بەیتێکی پارچە شیعری (لە جوملەی ماجەرای دووریی ویلایەت)دا هاتوون لە لاپەڕە ٢٤٦ی دیوانەکەدا ، منیش سوپاسی هەردوولا کاك فایزو کاك موحەممەدی مەلا ئیسماعیلی ئێنەیی ئەکەمو دەستی ئامین بۆ دوعاکەی کاك فایز هەڵئەبڕم . هەرچەند دڵنیایشم لەوە کە هێنانەدیی دوعای دوعاکەران بەدەست خەڵکەکە خۆیانەو مرازیان هەر بەخۆیان جێبەجێ ئەبێ .

لەبارەی بەیتی :

**لەمەوپێش شەممەیەك عەرزی ئەتۆم کرد**

**بلاّوە فیکرو . عەقڵم وەسوەسەی کرد**

(ب ٥ ، ل ٢٤٧)یشەوە ، نووسیویە : «ئەم بەیتە لە چاپی سێیەم بەمجۆرە چاپکراوە :

لەمەوپێش شیققەیێکم عەرزی تۆ کرد

بلاّوە فیکرو عەقڵم وەسوەسەی کرد

وابزانم ئەم دەقە مەلایانەترو ، هەروا کوردی‌یەکەشی لە (شەممەك عەرزی ئەتۆم کرد) ڕەوانترە» .

منیش ئەڵێم : ئەبوو کاك فایز ڕوونی بکردایەتەوە چۆن (شیققەیێکم عەرزی تۆکرد) لە (شەممەیەك عەرزی ئەتۆم کرد) مەلایانەترە ، لەکاتێکا کە خۆی ئەو ڕاستی‌یە دەرئەبڕێ کە (لە حوجرەدا باو بوو کە سوئالێك دەکرا ئەگەر باش وەلاّمی نەدابایەوە پێی‌دەگوترا : شەممەت لێ نەکرد . یان : شەممەیێکت لێ نەکرد ، واتە : بۆنێکت‌کرد . کەمێکت لێ زانی (لەڕاستیدا واتە : هیچ بۆنت لێ نەکرد . کەمێکیشت لێ نەزانی – م) ؟ تۆبڵێی تەعبیری مەلایانە لە دەرەوەی حوجرەی مەلاو فەقێ‌یان باوتر بووبێ تا لە حوجرە ؟ هەروەها ئەبوو بۆی باس بکردینایە چۆن (کوردی‌یەکەشی ڕەوانترە) لەکاتێکا کە نە ئەزانین (شیققەیێك) مەعنای چی‌یەو نە کاك فایزیش بۆی ڕوونکردووینەتەوە ! ئەوەیش بڵێم کە لە دەسنووسەکەی مەلا ڕەئووفیشدا هەر بەوجۆرەیە کە لە دیوانەکەدا نووسراوە .

لەبارەی بەیتی :

**لە لام ظیللی هومایە چەتری سەنبەر**

**چجایێ سێبەری سەروو سنەوبەر**

(ب ٣ ، ل ٢٥١)یشەوە ، نووسیویە : «ئەوەی لە زەمانی ئەدەبیی سەردەمی حاجی بەسەر زارانەوە بووە (چەتری چەنبەر – چەمبەر)ە . نازانم (سەنبەر) لە چیی و چۆن هاتووە ؟ چەنبەر : فەلەك» .

پێشەکی با ئەوە لە کاك فایز بپرسم لە چ بەڵگەو دەستاوێژێکەوە بۆی دەرکەوتووە تەعبیری (چەتری چەنبەر چەمبەر) لە زەمانی ئەدەبیی سەردەمی حاجییەوە بەسەر زارانەوە بووە ؟ قسەیوا لە ولاتێکا ئەکرێ کە ساڵەهای ساڵ بێ موختەبەری دەنگی تیابێ و قسەو پەندو ئیدیۆم و هەموو کەلەپوورێکی زمانەوانیی گەڵ ساڵ بەساڵ نووسرابێتەوەو هەڵگیرابێ و هەر تاوێك بمانەوێ بگەڕێینەوە سەری و بزانین چەند ساڵ لەمەپێش چ جۆرە تەعبیرێ لە هەر مەیدانێکا لەناو خەڵکا باو بووە . ئەم قسەیەی کاك فایز ئەیکا قسەیەك نی یە لە کوردستانێکی سەدان ساڵ لە جیهان پاشکەوتوودا بکرێ ، مەگەر مرۆ مەبەستی نەبێ ئەوەی ئەیڵێ ڕاستەو لە مەیدانی ئیسپاتکردندا خۆی ئەگرێ یا نە .

ئەنجا دێمە سەر بابەتەکەو ئەڵێم : منیش ، وەك کاك فایز ، نازانم (سەنبەر) چییەو ، لە فەرهەنگیشا نەمدۆزیەوە . بەلام بە نیشانەی شوێنی بەکارهێنانیا ، (چەتری سەنبەر) ئەگەر هەڵە نەبێ ، ئەبێ ناوی شوێنێ بێ لە ناوچەی کۆیەی نیشتمانی حاجی و زۆریش خۆش نەبێ .

**لە تێکستە** ئامادەکراوەکەی شارەزاو میراندا (چەرخی سەنبەر) نووسرابوو . منیش ، هەرچەند لە دەسنووسەکەی مەلا ڕەئووفدا (چەرخی سەنجەر) نووسرابوو ، لەبەرئەوەی مەعنای هیچ کام لە دوو تێکستەکەم بۆ ساغ نەبووەوە ، دەسکاریی تێکستەکەی شارەزاو میرانم نەکردو وەك خۆی هێشتمەوە . هەرچی (چەتری چەنبەر)ە ، ئەوە بەلای منەوە ڕاست نی یە ، چونکە (چەنبەر) هەرچەند بەمەعنای ئاسمان نی یە ، وەك کاك فایز نووسیویە ، بەمەعنای (دائیرە)یە ، ئەگەر بەمەعنای ئاسمانیش بێ بۆ ئەم شوێنە دەس نادا ، چونکە چەتری ئاسمان واتە سایەی ئاسمان بەسەر خەڵکەوەو ، شتێکی ناخۆشی تایبەتیی کۆیە نی یە تا حاجی قادر لە خۆشیی کۆیەوە لە سێبەری هومای لا پێ باشتر بێ کە لە ئەفسانەی میللیدا ئەڵێ بەسەر هەرکەسێکەوە سێبەر بکا ئەبێ بە پادشا . . ئاسمانیش هەرگیز نە مایەی شوومی بووەو نە کینایە بووە لە شوێنێکی ناخۆش . لە ئیدیۆمی کوردیدا هەیە ئەڵێن : فلانکەس چەرخی فلانەکەسی بە چەمەر گێڕا . . واتە : شایی لێ کرد بە شین ، واتە کۆڕی ئەڵقەبەستووی بەزم و ڕابواردن و خۆشیی لێ کرد بە کۆڕی شین و شەپۆڕو سنگ کوتان . دووریشە حاجی قادر ویستبێتی بڵێ ئەڵقەی شین و زاریم هەر بەمەرجێ لە کۆیە بێ لا بە یومن و فەڕترە لە سێبەری هوما بەسەر سەرمەوە .

لەبەر هەموو ئەمە ئەبێ بەهیوای ڕاستکردنەوەی ئەم بەیتەیش هەر چاوەڕوان بین .

**زەمانە تووشی دەردو غوربەتی کرد**
**غەمی کۆیێ پەرێشان هیمەتی کرد**

(ب ٦ ، ل ٢٥٣)یشەوە ، نووسیویە : (پەریشانی هەمووی کرد) لەوانەیە لە ئەوەڵەوە (پەریشانی هەمی کرد) بووبێ و بەهەڵە خوێندرابێتەوە . . ئەمەو ، لەبارەی کێش و سەروایشەوە (هەمی کرد) باشترە» .

منیش ئەڵێم : مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی بە (پەرێشان هیممەتی کرد)ی ڕاستکردووەتەوەو[١٥] منیش پشتگیریم لە بۆچوونەکەی کردووەو لێکم داوەتەوە چۆن لە (هیممەتی)یەوە بووە بە (هەمووی)[١٦] ، ئیستایش هەر لام وایە بۆچوونەکەی مامۆستا ڕاست و بەجێیە .

لەبارەی بەیتی

**شەریعەت گەر بزانی یا نەزانی**
**وەکوو کەر دەچنە بن باری گرانی**

(ب ٧ ، ل ٢٥٨)یشەوە ، نووسیویە : «(نەزانی) بەمانای (نەزانیٚ)یە ، واتە : (ی)کە ڕاناوی شەخسی سێیەمە . بۆ ڕێکیی سەروا نیشانەی (ٚ)ی (ی)ی کراوە لادراوەو ، بە شێوەی زاری کۆیەی سەردەمی حاجی نووسراوە : ئەمەش

کارێکی ڕەواو پەسەندە ، بەڵام دەبوایە ئەم کارە لە سەرتاسەری وشەکە کرابایەو (نزانی) نووسرابایە ، چونکە پەیڕەوی‌کردنی شێوەی کۆیێ لە بەشێکی وشەو گوێ‌پێ‌نەدانی لە بەشەکەی‌دی ، دەکەوێتە بەر (اتباع الرخص)[17] کە کارێکی ناجایزە . ئەمەو ، ئیقاعی (نزانی) ڕێك‌و خۆشترو گونجاوترە لەگەڵ (بزانی)ی پێش خۆی‌و (گرانی)ی سەروای نێو دێڕی دووەم» .

منیش ئەڵێم : هەرچەند ئەم داوایەی کاك فایز داوایەکی لەڕووی (شەرع)و مەنتیقەوە بەجێ‌یە ، بەجێ‌هێنانی کارێکی ئاسان نی‌یە ، چونکە ئەبێ بەچیدا دڵنیا بین کە حاجی هەموو وشەیەکی شیعرەکانی بەگوێرەی دیالێکتی ناوخۆیی کۆیە بەکارهێناوە ؟ ئەنجا ئەبێ ئەوەیش بزانین کە لەو سەردەمەوە تائێستا چ‌گۆڕانێ بەسەر دیالێکتی ناوخۆی ناوچەی کۆیەدا هاتووە .

لەبارەی بەیتی :

**سێ قەبیلە حەقیرو (بێ‌رومەتن)**

**کوردو ڕۆم‌و یەهوودی گومراهن**

(ب ۲ ، ل ٢٦٤)یشەوە ، نووسیویە : «مامۆستا محمدی مەلا کریم لە پەراوێزدا نووسیویە : ڕستەی نێو دوو کەوانەکەمان بۆ ساغ‌نەکرایەوە . ئەگەر ڕێنووس‌کراوی نێو دوو کەوانەکە تەواو بێ ( ؟) لەوانەیە (بێ‌ڕوومەتن – بەی‌ڕوومەتن) بووبێ ، واتە : ڕەنگ‌زەردن . ڕوومەت : کوڵمە ، ڕوو» .

منیش ئەڵێم : ئەگەرو مەگەری پێ‌ناوێ . دیارە هەڵەیەو ، تەنانەت منیش کە کاتی خۆی خستمە ناو دیوانەکە ئەمزانی هەڵەیە ، تەنها بۆئەوەم نووسی‌یەوە لە بەرچاوا بێ بۆ ساغکردنەوە لە دوارۆژا ، چونکە هەرچۆن بێ تێکستی هەڵە جۆرە پێوەندێکی هەر هەیە بە تێکستی ڕاستەوە .

ئەگینا هەمووکەسێ ئەزانێ (بێ‌ڕوومەتن)و (گومراهن) بەرانبەر بە یەك ناکرێن بە دوا وشەی بەیتە شیعرو ، لەوەیش زیاتر (بێ‌ڕوومەتن) هیچ مەعنایەك نادا بەدەستەوە لەم شوێنەدا .

ئەمە ئەمەو ، سوپاسی زۆریش بۆ کاك فایز کە بە وتارەکەی شێوەی گفتوگۆو موناقەشەی سەردەمی حوجرەو فەقێ‌یەتی بۆ چەند سەعاتێك بۆ زیندوو کردمەوە بەڵام لە بەرگێکی تازە بابەتدا .

**پەراوێزەکان :**

(١) – دیوانی حاجی قادری کۆیی . لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی کەریم مستەفا شارەزاو سەردار حەمید میران ، پێداچوونەوەی مسعود محمد . بەغدا . ١٩٨٦ . چاپخانەی (دار افاق عربیة) ، لە بڵاوکراوەکانی ئەمینداریێی گشتیی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی کوردستان .

(٢) – عبدالرزاق بیمار . ساغکردنەوەی دیوانی حاجی‌قادری کۆیی . گۆڤاری بەیان . ژمارە ١٢٠ ، حوزەیرانی ١٩٨٦ .

(٣) – محەمەد جەمیل ڕۆژبیانی . سەرنجێکی سەرپێ‌یی دیوانەکەی حاجی‌قادرو ڕەخنەکان ، گۆڤاری بەیان . ژمارە ١٢٣ . ئەیلوولی ١٩٨٦ .

(٤) – فائیزی مەلا بەکر . دیوانی حاجی قادری کۆیی‌و چەند سەرنجێك . گۆڤاری کاروان . ژمارە ٤٧ ، ئابی ١٩٨٦ .

(٥) – أ . لە وەڵامی وتارەکەی عەبدوڕڕەززاق بیماردا . بڕوانەرە : محمدی مەلاکریم . بە ڕێگای ڕاستکردنەوەی شیعرەکانی حاجی قادری کۆیدا ئەمەیش هەنگاوێکی‌تر . گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد . ژمارە ١٥ . ١٩٨٦ .

ب – لە وەڵامی وتارەکەی مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانیدا . بڕوانەرە : محمدی مەلاکریم ، پێداچوونەوەیەکی بەکاوەخۆی سەرنجە سەرپێ‌یی‌یەکانی مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی لە دیوانی حاجی قادری کۆیی‌و ڕەخنەکانی عەبدوڕڕەززاق بیمار . گۆڤاری بەیان . ژمارە ١٢٦ ، کانوونی یەکەمی ١٩٨٦ . ژمارە ١٢٧ . کانوونی دووەمی ١٩٨٧ .

(٦) – ئەم (لە)یە لە نووسینەکەی کاك فایزدا نەبوو . بەڵام پێویست بوو . بۆیە نووسیم .

(٧) ئەم (لە)یەیش لە نووسینەکەی کاك فایزدا نەبوو . بەڵام پێویست بوو . بۆیە نووسیم . لەمە بەولاوە هەڵەم بۆ ڕاست‌نەکردووەتەوە . بەڵام تێکرا دەسکاریی شێوە نووسینم کردووە .

(٨) – مەبەستی کاك فایز لە وتارێکی کەریم شارەزایە بەو ناوونیشانە لە ژمارە ١١ی ساڵی ١٩٨٤ی گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد . ل ٢٠٣ ٢٦٣دا . بڵاوکراوەتەوە .

(٩) – بگەڕێرەوە سەر پەراوێزی سێهەم .

(١٠) – بگەڕێرەوە سەر پەراوێزی پێنجەم (ب) .

(١١) – القران الکریم . سورة الفرقان . الایة ٤٧ .

(١٢) – القران الکریم ، سورة القصص . الایة ٨٥ .

(١٣) – تەعقیدی مەعنەوی لە زانستی ڕەوانبێژیی عەرەبیدا . کە دیارە بۆ زمانی‌تریش هەروا دەست‌ئەدا ، بریتی‌یە لە بەرودواپێ‌خستنی وشەکانی ڕستە بەجۆرێ کە ببێ بە هۆی ئاڵۆزبوونی تێگەیشتنی مەعناو نیشانەیەکیش دیار نەبێ بۆ ڕوونکردنەوەی ڕووی ڕاستی ڕستە .

(١٤) – ڕاستەکەی ، لە شێوەنووسینی کۆندا (ژ) ناکرێ بە (ز) .

(١٥) – بگەڕێرەوە سەر پەراوێزی سێهەم .

(١٦) – بگەڕێرەوە سەر پەراوێزی پێنجەم (ب) .

(١٧) – (اتباع الرخص) لە ئوسووڵی فیقهدا بەوە ئەڵێن مرۆ لەنێوان دوو بۆچوونی موجتەهیدا ، لە هەر مەسەلەیەکا . هەمیشە شوێنی ئاسان‌ترەکەیان بکەوێ . ئەمە لەبەر ناچاری نەبێ دروست نی‌یە .



بەبۆنەی چلەی (کامەران)ی نەمرەوە

# کامەران موکری

کامەران موکری

لە زیندانو ، لە بیابانی (سەلمان)
لە نیشانەی برینەکانی سەرشان
لە سالآنی لاوی – ئەمەن پشکووتن–
هەلی عومرم ، گوری هەولی پیشکەوتن
لەو سالآنەی لەگەلٚ زنجیرا ، ژیام
لەو هەرەسەی ژیان بە سەریا ، هێنام
لە ژووری تەنگ ، زینچکەی جرو جانەوەر
لە (شێی) دیوار ، وەردیانی مۆن ، خوێنی سەر
لە قەتاغەی لەشی بە دار شیتالٚ بووم
لە لێدانی دلٚی بە (حوریە) قالٚ بووم
لەو پەنجانەم کە ئاگریان پیا چزان
لەو جومگانەم کە لە یەکتر ترازان
لەو کەسانەی تا دوێنێ بوو وەك دوژمن
کۆتیان کردە پیی سەدانی وەکو من
لە کۆتی پیێ ، کەلەپچەی دەست بپرسن
من چیمو کێم ! ! ئەوان چاکم ئەناسن

* * *

لە دارخورماو لە بیابانی سووتاو
لە سەرابو سەبوونو خەیاڵی ئاو
لەو چاوانەی خوێنی قینیان تێ زابوو
لەو کەسانەی بەشیان تەنیا سزابوو
لە کۆرپەکەم ــ دووکەلٚی تاسەی ئەوسام
لە دەروونی ژەمبووردەبووم بۆ پەیام
لە بیرکردن ، خۆزگەی تاساو بۆ ئاوێ
گری دەروون دامرکێن پێ بو تاوێ
لە کاسەیەك دۆی سەرتەزینی کوێستان
خولیای شنەی جێی نسرمی دارستان
لە برسێتیو دووریو ، لە بێبەری بوون
لە گشت خواستی ، خاوێنی دلٚو دەروون
لە کۆتی پێ ، کەلەبچەی دەست بپرسن
من چیم وکێم ! ! ئەوان چاکم ئەناسن

* * *

قارەمان نیم ، بەناوبانگ نیم ، گەورە نیم
شاعیرێکم بۆ نەتەوەی کورد ئەژیم
چیم لە دەست هات کردم بۆ نەتەوە خاك
چیم بەسەر هات ، دام بە خەندە بەبێ باك
سەرم بەرزە ، سەرشۆر بووبم نەزانی
ئارامی خۆم ، تاسەم کرد بە قوربانی
لە چیاکان ، لە لووتکەی بەرزو ... نووا
«لە ئاگری بە نێلەنێلی بروا»
لە کۆتی پێ ، کەلەبچەی دەست بپرسن
من چیمو کێم ، ئەوان چاکم ئەناسن

---

لە ژمارە (١٧-٩/٥/١٩٧٠)ی
رۆژنامەی (هاوکاری)یەوە وەرگیراوە

# ژ ئەڤیندارا شاهینوی

شاهینۆ مال باب خرابۆ
چیاکێد گوندێ مە دبلندن
دبەفر بارین
چیاکێد گوندێ مە دبلندن
دباران بارین
تو بخودێ کەی
بۆ جارەکێ لمن نانێری
تە کی هەیە
کی وەکی من بۆ تە نارین ؟ !
شاهینۆ مال باب خرابۆ
دنیڤا گوندکێ مەدا
دوو رویبارێد ئاشق دمەشن
دبانیا گوندێ مەدا
هەر دوو رویبار . .
ڤێك دکەڤن
ئەزو تو بۆ دبەخت رەشن ؟ !

* * *

شاهینۆ مال باب خرابۆ
کانیکێد زۆزانا زانیە
ئاڤکا تەزی لزۆما بۆشەو
ئاڤ لێ رابوو
ئەو کەنگی بوو
بویك لەیلانا جەرگ لێ سۆتی
پەری لهنداڤێ درا بوو ؟ !

* * *

شاهینۆ مال باب خرابۆ
بۆ بۆ من ناهێیە رابێ ؟
تە چ خەمە ؟ .
ئەزا رەبەن کەڤتیمە . .
. خەفکا ئشقا تە
نە نەخۆشم . .
نە دەردەدارم ب تابێ
گرێ ڤینا من دژوارەو
دیارە پێ تو نا سۆژی
پەلەو . .
پەل کەڤتە ناڤ کابێ
هابێ . . هابێ
سەد جار هابێ
چ حەق ئەڤرۆ
ئشقا من من بکوژیتن
دەردێ دلێ من گرانەو
بۆ کێ بێژم . .
گەر شاهینو نەهێی رابێ ؟ !

●

**صدیق خالد هروری**
**١٩٨٦/١١/١٥**

●




قەوسی پاییز ، گەڵا ڕێزان ،
لەو دەمەدا ،
شەختە وەکوو دەمە گوێزان ،
گۆنای شیلانو شەنگەبی ،
شەقار دەکا .
«گەردەلوول»ی گێژو گەلۆر ! ،
فوو لە چرای گوڵزار دەکا .
خۆڵ لە چاوی ڕووبار دەکا . ! !
«قوڵینگ» کوێستان ، بەجێ دێڵێ ،
بەرەو . .«گەرمەسێر» بار دەکا . !
کرێوەی کەڕ ، وەکوو دێوێك
هەڕەشە لە نزار دەکا .

داری بەڕوو ،
خۆڕاگرتوو ،
پەلو پۆ ڕم ڕاوەستاوە ،
خەنجەری خۆی ،
لە ڕووی زریان هەڵکێشاوە . !
ترسی نی‌یە ، لە هیچ وەرزێ ،
لە بەر زوقمو زۆری پاییز
چۆن دەلەرزێ ؟ ! .
لەو تافەدا ، تەشقی سەرما ،
توندو تیژو تۆفو تاوە .
کە پێی دەڵێن (زستانی تووش)
لەو ڕۆژەدا ، (برایمۆك)
لە کوێستان‌دا ، لێی قەوماوە .
پێی دەگوترێ ، (چلوانی تووش) !
بەفر دەبێ بە (نەهەنگی مرۆڤ هەڵلووش)
داری بەڕوو ،
ڕەق هەڵنایەو نابێ بە پووش ، ! !
لە (چلە)دا (چرۆ) دەگرێ .
لەو شاعیرە شوانە دەچێت ،
وەرز نەزۆکە ،
لە ژەکی ژان (فرۆ) دەگرێ . !
داری بەڕوو ، لە هاوین‌دا ،
لەناو گردا ، «گەزۆ» دەگرێ . !
وەك ئەو دڵەی کە (پۆڵا)یە ،
گوللەو گوڵو (پشکۆ) دەگرێ . !
نەك ئەو دڵەی کە نایلۆنە ،
(پارە)و (پایە)و (پەرۆ) دەگرێ . ! !
ڕاستە «برۆ لەسەر چاوە»
کەسێك چاك بێت
جێ لە سەروو (برۆ) دەگرێ . ! !

هەرکەس ئارەزووی خۆیەتی ،
مەڵێن ،
«ئەو ڕێیە (بۆ) دەگرێ ؟ !
داری بەڕوو ،
دەبێتە موور یاخود ڕەژوو ،
زۆر حەز دەکا وەرزی زستان
کە ببێتە ئاگرو دوو ،
بۆ جووتیار و پاڵەو شوان
بەڵام نابێتە حەیزەران !
بۆ داردەستی (سەردار)و (خان) ! .
داری بەڕوو ،
(بەر)و (بێز)ی زۆرت هەیە .
(کورەزۆکە)ی کێوو (کەژ)یت .
خوا عومرێکی وای پێداوی .
لە (نووح) گەلێك زیاتر دەژیت ! !
تۆ پیرۆزیت
خاوەن جوانتر بالاو (بەژن)یت ،
بەڵام وەکوو کیژۆڵەی شوان ،
تۆ بێنازیت ، تۆ بێ (جەژن)یت ! ! .
کە ئەستێرەی (ڕێی کاکێشان)
دەڕژێو دەمرێت .
زوو دەبێتە مشتێك (سووتوو) ،
زۆر حەزدەکا ،
گەردو تۆزی لاشەکەی خۆی
کە ببێتە (پەیینکە)یەك ،
بڕژێتە ژێر داری بەڕوو . !
تەنیا دارە ، لەم سەر ئەرزە ،
کە بەو جۆرە وورەی بەرزە .
دەیسوتێنن ، دەژێتەوە ،
چاکتر سەوز دەبێتەوە .

# کوێستان

**بەخیالی تاهیر بازیانی**
**قەلادزێ**

کە تاوێ دڵم ئارام کەم ، خەیاڵ دەمباتە کوێستانێ .
لاوكو حەیران ،جێژوانی کۆن ، بۆمن دەبن بە هەتوانێ .
ڕەنووی بەفران ، کاتێ تەزیوو ، قەڵبەزەی ئاو ، مێرگی سەوز
دەیسەلمێنن بوونی – یاری– بەهێزترن لە ئاسمانێ .
پردی بەفرین تا چلەی هاوین پشتی کۆم بوو بۆ هاتوچۆ
زۆری مابوو بتوێتەوە ، ئیدی باری بە زستانێ .
کەنێرو گیابەندو بیزا مەستم دەکەن دەبۆنیدا . . .
ڕووحێ وانە ، بۆنی تیرۆژ لێکیان داون لە جۆشدانێ .
مێگەلی مەڕ ، لە لوتکەی کێو ، دیاری نادا تیێی بڕوانێ
دەخۆی گرتوون ، هەورێکی ڕەشی ، شریخەی دەدا بۆ بارانێ .
قاسپەی کەوێ ، لە دوای بانگی لە نێو ڕەشماڵێم بانگ دەکا
وەخۆکەوە ڕۆژ بۆتەوە ، دوای کرنووشت بۆ یەزدانێ .
حۆری ئەرزن لە جوانیدا کیژی مەنگورو مامەشان . . .
جافو بڵباس هاوتای وانن چەپکێ گوڵن لە گوڵدانێ .
«دەیپەرستێ خاکو خۆڵی ، دەشتدەرو چیاو چۆلی
کەسێ وورد بێ وەکو شاعیر ، گەر جارێکی تیێی بڕوانی .»

# هیڤی

مەسعود حسێن

-١-

یاریێ . . یاریێ
ژمێره وەره
بێ خەندقیم
د چاڤێد تەدا !
تو نە بێژە
نا گەهین ئێك
سەد بەكروكو نقشتی
بی دخە بتن
درێكا مەدا !
ئەزا دبینم
پیرا تیێ
كوینێ خوێی مال شەوتی
ل هنداڤی سەرێ مە ڤەدا !

-٢-

یاریێ . . یاریێ
ژ مێژە وەره ،
یا هاتی گوتنو :—
د بێژن
(مێریكەكا گەلەك لاواز
بو كەڤرەكی د چو ئەڤراز
جارەكێ چو
كەتە عەردی
جارا دویێ . .
ئو یا سیێ . .
یا چاریێ ژی . .
ما ب وی دەردی
جارا شازدیێ
ویێ خو لڤاند
كرن داخاز
ل سەر كوپیتكا كەڤرێ بلند
ب دەنگەك بلند
ویێ ژ دل دان
بانگو ئاواز
بانگو ئاواز)

-٣-

ئەڤجار یاریێ
دێ گەهین ئێك
هندی سالاێ مە درێژ ببت
هندی بەكروك باخڤیتو
بێ پر بێژ بیت
دێ گەهین ئێك
ئەز بو تەمەو
تو بو منی
گەر دلێ تە
بو من ژەنی
دێ پر تكن قەیدو زنجیر
دێ سەرێد خو چەمینن
خر ئەزبەنی
بابێ منو
بابێ تەنە !
ئەڤرو . . ئەڤرو
دچار چوڤەكێ تەنگدا دژین
سوبە ژیانەكا نویتر
بو مە كەیە
كێلو ڤەنی !
هوسان من باوەریيا هەی
دێ گەهین ئێك
بوتە دكە نم
دكەنم . . . دكەنم
تو ژی زل بومن دكەنی
بو من دكەنی

# بیر هاتنا شەش ئەڤیندارا

زینێ . . . . . زینێ
خەما نەخو
ژ بەر تەحلاتیا ئەڤێ ژینێ
مەمێ نازدار
ژ دل کوڤاندار
هلکرنڤە مومکێت ڤینێ
ژ ئەڤ واری
دێ چیت تاری
نەحەز نابن بکەن نەیاری
پاشێ تێر تێر
بکە حەنەك
د گەل مەمێ خوە بکەیاری

* * *

خەجو . . . . خەجو
نەکە گری و نەلورینە
ڕویکێ نازك
لبەر هێسترا نەشارینە

هلو ڕابە تەماشەکێ
تو بخودێ کە
بچاڤێ سەرێ خوە بینە
چاوە ئەڤیندارێت دنێ
تیرو کڤان
هەلگرتینە
هزار کەلەکویڤیا دکوژن
بوتەو سیابەندێ ڕەبەن
ئڤروکە ئەو
داوەتینە . . . . . داوەتینە

* * *

لەعلیخانێ . . . .
لەعلیخانێ
نەچاڤ کلێ چاڤ دەرمانێ
بەس پسیارکە
هەسەم کانێ؟
دوهی پیر بوو .
من کر گەڕهان لناڤ وەلاتێ
م گوهدایێ
یالە یالە
ژ تلیلیاو نافتیدانێ
م دیت هەسەم
لناڤ شەهیانێ
م گوت هەرێ ئەڤە زاڤا
پا بویك کانێ؟
گوت من لاوو
خەملینین لە علیخانێ . . لەعلیخانێ

●
(حبیب بناڤی)
●

# لاژەیەکم ...

# چی گەرویەك دەمڵێتەوە؟!

● موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی ●

٢٠-١٢-١٩٨٥
هەولێر

نە خەونێك بووم ،
لە ئامێزی مێژووی تاڵ‌دا
بتلێمەوە ،
نە تەونێك بووم ،
لە ڕۆژگاری نەهامەتی‌ی سواری دڵ‌دا
ببڕێمەوە ،
«لاژە» یەکم ،
ووشەکانم . .
گەلای سەوزی بەهارێکن
لە پێنووسی «عوریانەوە»
چرۆی گەشیان
هەڵهێناوە ! !

نە غەمی چەرخ
ڕێ‌ی ڕووباری ووزەی دڵیان
دەخواتەوە ،
نە درکی ڕۆژ
ڕەنگی گەشی پەڕەی گوڵیان
دەشواتەوە ! !

* * *

دەنگی لاژەم ،
گوێ‌کەرکەری گوێ‌ی مێژووە ،
دەنگی هاژەم ،
هاژەی گەرووی گشت دەنگێکی چاونەترسی
تێکەڵ‌بووە ،

شۆرەسواری ووزەی ئێستاو داهاتووە ،
گڕی شێتیی تافی پێشووی . .
تێبەربووە ! !

* * *

کاتێك (نالی)
لە گەردوونی ووشەی سەروای دڵلەرزێن‌دا ،
مۆمی گەشی تەمەنی خۆی . .
بۆ (حەبیبە) هەڵدەوەراند ،
(خانی)و (فەقێ)
وێنەو دێرە سفتەکانیان
بۆ چاوی شیعر
دەهۆنیەوە
ڕێی (جزیری)یش لەو بووارە دژوارەدا
چاوی هۆشی نەدەترووکاند ! !
من ئەو لاژە پڕ هاژە بووم
ووشەکانم پێك‌دەهێنا
نووکی خامە گەشەکانم
ڕادەهێنا !
کە سروەبای (شارەزوور)ی دڵ ،
نامەی . . «سالم»ی برد
زامی دڵی دوور ووڵاتیی شاعیرێکی
کولاندەوە
منی هەواڵ
دڵی کۆرپەی خەفەتی خۆم
لاواندەوە ،
هەستی ناخی زامەکانم
گشت ووروژاند !

زامێکی دیم
لە فەرهەنگی بێ‌شیرازەی
هەواڵ‌دا چاند ! !

* * *

وشەیەکم ،
چی پینووسێك . .
ڕەنگی چاووم دادەڕێژێت ؟ !
سەروایەکم
چی شاعیرێك ڕێم پێ‌دەبات ؟ !
هاژەیەکم
چی سیروانێك لێکم‌دەخات ؟ !
بۆ ڕوخسارو گڕوگاڵم
پێ‌دەکەنێت ؟ !
چاوەڕوانی گەروویەکی سڵ‌نەکردووم
چی گەروویەك . . دەنگ‌هەڵ‌دێنێت ،
دەملێتەوە ؟ !

**تێبینی**

لاژە : گۆرانی ، هۆرە ، سروود
بتلێمەوە : لەناو جێ‌دا گینگڵ بدەم
تەون : ئەو ئامێرەیە مافووری پێ‌دەچنن
نەهامەتی : نەگبەتی ، نشوستی
ببڕێمەوە : بپسێنم
هەڵهێناوە : دەرکردووە
چەرخ : سەردەم
هاژە : دەنگی با ، دەنگی تاڤگە
تاف : دەم ، کات
سفت : توندوتۆڵ ، ڕێك‌وپێك
نەدەترووکاند : نەدەنووقاند
بێ‌شیرازە : بێ‌چەشن ، بێ‌سنوور

# سەدای یاخی بوونێکی پیرۆز

بەرزان هەستیار
سلێمانی ١٤/٩/١٩٨٦

**«تا کوتروسکەیەك لە ژیانما بەدی بکەم حەزئەکەم بژیم ، کە لە کەناری مردنیش نزیك بوومەوە . نامەوێ مەسەلە گەورەکان لە تەمی خەستی دوودڵیی و وونبوونا بخنکێن .»**

هەتا دەنگ بوویت ،
هەموو گیانم بوو بوو بە گوێ
هیچی ترم نەئەبیست و
نەشم ئەویست ، گوێم لە هیچ گۆرانییەك بێ
هەتا تیرۆژو هەتاو بوویت ،
منیش دڵم کێڵگەیەکی فراوان بوو
بە بێ سۆزی ئەنگوستی تۆ .
رەش ئەچۆوە . وەکو قژت
زەرد ، وەك گەڵایەکی مردوو

* * *

ئەی ئەو دەنگەی تیژ تێپەڕیت .
ئەی ئەو تیشکەی ، کشایتەوە دەروونی هەور
چۆن وا کەڕو کوێرتان کردم ! ؟
ئەمشەو بۆ بینایی چاوو
پەردەی شەق بووی گوێی خۆم گەڕام
دۆزیمنەوە .
لەو دیو دیواری عاتیفەی . جڵەوگیرو
بێ ئاگاما بەدیم کردن .
دۆزیمنەوەو
بەسەر پردی هیوایەکا تێئەپەڕین
سەیری چەمێکی بە خوڕو ،
بانگی پیرۆزیان ئەشنەوی[1] .
خۆش بە حاڵم
چراکەم خامۆش نەبووە ،
ئەو شتانە لەبەر تیشکیا روون ئەچنەوە
کە تۆ لە چاویانا تەنها .
ئاسکی قەد لاپاڵێکی و
بە ئاستەمیش بەدی ناکرێی
ئەی عاتیفەی سەر کاروانی .
گیان و هەستی ئەو رۆژانەم
ئیتر سەر بە ماڵتا ناکەم . . .
نەبا چاوم کوێر بێتەوە
نەوەك ئەمجارەش هەڵدێرێم ،
گەر رۆژێ تر پێی هەنگاوم . . .
نایەوە بە جەرگی خۆما
چراکەم بەجێ ناهێڵم
ئیتر پەنجەکانی دەستم
زاخ نایانکاتە کۆی زووخاڵ
بێ دەنگ نامرم .
گوێ شل ئەکەم بۆ سەدایەك ،
دەنگێ ، دەنگێکی پڕ زوڵاڵ . .

(١) - ئەشنەوی : ئەبیست .

# ڤیزا گوندی

دایکا میرخاسی

ڤیزا گوندا بخێرو بێرێ
چاڤ بەلەکێ و ددان زێڕێ
بەختێ تەمە وەرە ڤێرێ
ناز شرین و شۆخ و شەنگێ

* * *

سێ‌پیکا مەشکا خۆ دانی
ئەی هۆزانا فەقێ و خانی
تویا سل بوی منێ زانی
تاج و نیشان و فەرهەنگێ

* * *

شیر مەشك و پارزینکێ دلا
دێ باڤێ سەر هەردو ملا
داڤەلێ نەچن ناڤ سۆرگولا
شەمالکا شۆرش و جەنگێ

* * *

زۆزان وارێ داد سینەمێ
دگەل تەبەرێ خۆ ددەمێ
ڤیزا خانزادو ڤەفەمێ
بۆچی بلند ناکی دەنگێ

* * *

ئەنی سپی و دلێ پاقژی
بۆ ئەڤینێ خین درژی
هەمی دەما دلێ شاد بژی
دا ل ژیانێ نەکەی ژەنگێ

* * *

خودانا گەردەنی و زێڕا
چاڤین تەنە وەکی ستێرا
ماف بستینە مینا مێرا
ب ڤەلەم و ب تفەنگێ

* * *

نەڤیا ئاری و مادو ڤازی
دەنگێ تەیە سەر فیرازی
بن دەستێ نەبەرازی
شۆلکەرو ژیرو چەلەنگێ

* * *

بهنا عەشق و سەربەستێ
یا ل سەر ڕێکێ سەیرانێ
ڕۆژا جەنگ و مێرانێ
شورو ڕم و هەم خەدەنگێ

# سێ شیعر

بەیار باقی

### عەمێ گۆزێ

لەشکەرێ بشارێ چەتو
هەر هاتوچو
هات . . هات
ب سەر گوندێ مەدا گرت
لویلی یا تفەنگا دەستێ
عەمێ گۆزێ ژی . . دایێ
ژنگارێ گرت . .
لێ هێشتا زەری و خورت
بێ لسەربانا
دەنگێ،
تلیلی و ناڤتێدانا وانا
ژ عەموی رە . . گەرمە

دبێژن :
عەمۆ لاوۆ

چەپەرێ خو تو نەبەردە
خوەشمێرو ، ژ تەرا شەرمە !
لێ نزانن ! !

گەر خوەشمێرێ
مالێ هەر بتنێ عەمۆ بیت
عەموژی ئەڤرو بێ ساخەو
سوبەهی . کەلەخو تەرمە

### ئوخۆزی د خرابن !

خۆزی . . ؟ !
خۆزی ببامە
گەمی ڤانەك
شرین جانێ
هەمی دەریاییت جیهانێ
داشەقینم . .
تا د گەهامە
دەریاوانێ
بەرب ، سپیانێ خەلات
داگەمیا خۆ راوەستینم
تا سیابەند
ژوێڤە دهات . .

دابێژمێ :
ئەی شاهێ شێتێ ئەڤینێ
دێ خەجوێ
وێ سینگ باغا
دەستێ چوئاغا ، نەچوێ
دێ کیڤە رەڤینێ ؟
بوتە د بێژمو
توبزانە . .
خەجۆ ، خۆشکا حەفت برانە ! !
ئەڤیناوێ
بارەك سەختو . . پرگرانە
قەت نەبێژە
ئەڤ چولەکا بێ خودانە
ودێ لێ شینبن
هەمی هویڤی
کەس بواریێ بویك وزاڤا
ناحەسیتن
تو گوهـ بدە
کەلێ کویڤی
ئەوێ شاخا
ژبۆ سینگێ تە د هەسویتن ! !
ڤێجار . . دێ تو زوی بە وەرە
ئەم برەڤین
ژڤی واری . .
بێکو . . لێشین نەبیت
ئەڤینو
ئەڤینداری ! ! !

زاخو/١٩٨٥/٩/٧

## من دڤێت

من دڤێتو من دڤێت
جوان بت ، یان ژی کرێت
زەری هەمی جوانن
سەبرا دلێ م ب تەنێت

* * *

سپی بت ، یان ژی ئەسمەر
گوندی بت یان ژی کۆچەر
سەدا لبەر دلی دانن
هەرتو بتنێ بی دلبەر

* * *

سینگ بەفرا کەڤرو لاتە
بجوانیێ رەنگ وەلاتە
دکەمو ناکەم من چاڤ
تێرنابن ژ دیتناتە

* * *

تێرنابم ژ وان چاڤا
وان خابیرو سویلاڤا
بەژن تاکا ریحانێ
ئەڤینا دەمو گاڤا

* * *

کراسو فیستان کوردینە
لدودەستا لەوەندینە
تویی رەوشادیلانێ
هەردو ملابهەژینە

١٩٨٦/٣/١٤ —دهوك—

# فلیمی «بوون بەخۆر»

چیرۆك وسیناریۆی : ئەحمەد سالار

بینراو (١) :

**کات - رۆژە . شوێن - ڕاوگە - دەرەوە .**

١ - (Close Up)دێوجامەیەك دەردەکەوێ ، وێنەکە لەسەر کونی تێروانینەکەی ڕادەوەستێ (Diaphragme) .

٢ - (Medium Shot)دوو چاوی ڕاوچی یەکە دەردەخات (Zoomin)چاوەکان دەسورێن . تەماشای ناوچەکە دەکەن .

٣ - (Complet Shot)کامێرە لە چاوی ڕاوچی یەکەوە لە ناوچەکە دەڕوانێ (Zoomin)بینراوی ڕاوەکەو دەردەکەوێ ، کەوێك بۆ ڕاوکردن نراوەتەوە .

٤ - (Bigclose Up)چاوی ڕاوچیەکە لە وریا بوونەوەدایە .

٥ - (Close Up)قەفەزەکە دەردەکەوێ (Zoomout) لەوەوە کۆمەڵە کەوێك دەردەکەون کە لە کەوی قەفەزەکە کۆبوونەتەوە .

٦ - (Close Up)کەوێك دەخوێنێ .

٧ - (Medium Shot)کاکڵی ڕاوچی تفەنگەکەی دێنێتە سەرپێ .

٨ - (Medium Shot)کۆمەڵە کەوێ .

٩ - (Complet Shot)کەوەکان ، (Zoom Out) (کاکڵ دێتە کادرەکەوە ، کەوەکان لە دوورەوە دەردەکەون (Super)کاکڵ ئامادەی تفەنگ تەقاندنە .

١٠ - (Big Closeup)کاکڵو تفەنگەکەی ، وێنە لە شێوە بازنەیەکدا تەسك دەبێتەوە (Diaphrăgme) پەنجەی لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکەیە . دەنگ نامێنێ .

١١ - (Medium Shot)کۆمەڵە کەوێك . (Super)لە نێوان ئەم وێنەیەو وێنەکەی پێشتر . بۆچەند جارێك دووپات دەبێتەوە .

١٢ - (Mediumshot) تفەنگو دێوجامەکە ، چلەدرەختێك دەچوڵێتەوە (wipe)وێنەی پەنجەو پەلە پیتکە .

١٣ - (Complet Shot)کەوو درەختەکە ، وێنە ڕادەوەستێ .(Stop) . (Cat)

١٤ - (Close Up)پەنجەو پەلەپیتکەی تفەنگەکە .

دەنگ :-

(کاکڵ کورە کاکڵ . . .) دەستی شل ئەبێو سەر هەڵئەبڕێ .

١٥ - (Long Shot)کەوەکان ئەفڕن ، کامێرە (Ran Right) و (Pan Left)دەکات ، کۆمەڵە درەختێکی چڕ (Zoom in)شوانێك دەردەکەوێ .

١٦ - (Close Up)دەمو چاوی شوانەکە دەردەکەوێ (Cut) .

١٧ - (Close Up)ڕووی (کاکڵ) .

١٨ - (Medium Shot)شوانەکە لە (کاکڵ) نزیك دەبێتەوە

١٩ - (Long Shot)شوانە دەست بە (کاکڵ)ەوە دەگرێت .

دەنگ : شوان / ئێ ی کاکڵی بەدبەخت ، ئەوەچی ئەکەی ؟

لەچ خەو خەیاڵێکای ؟ .

کاکڵ / دەك بەخێر نەیەت ، ئا ئەمە کات بوو هاتی ؟ تۆ نەبویتایە ، چاکم پێکابوون ؟ ئەزانی لەکەیەوە لە پارێزامو خۆم بۆ ناو نەتەوە ؟

شوان / هێ ی ئاش لەخەیاڵێو ئاشەوان لەخەیاڵێ ، کورە

مردکەت نەمریٚ ، برۆ بەلای دەردی خۆتەوە ، واکار لەکار ترازا .

کاکل / چی‌یە ! ئەوە باسی چی ئەکەی ؟

شوان / ئەوا تەدارەك ریٚئەخەن ، ئەوە خوازبیٚنی‌و دەست ماچ کردنە .

کاکل / بۆ کیٚ ؟

شوان / بۆ کاڵیٚ گیانەکەت .

کاکل / نەڵیٚی ! .

٢٠ – (Close Up)لەسەر رووی (کاکل) بەسەر سورمانەوە هەڵئەسیٚتە سەرپیٚ . کامیٚرە (Til Up)لەگەڵی هەڵئەسیٚ درەخت‌و هەورپیشان دەدات . کامیٚرە دەسوریٚتەوە .

٢١ – (Close Up)دوو دەست تارا لە روی کاڵیٚ لائەدات لەگەڵ ویٚنەی (٢٠) (Dissolve)دەبیٚت . (Cut) .

٢٢ – (Big Close Up)کاکل هەردوو دەستی بۆ ناوچەوانی دەبات .

٢٣ – (Big Close Up)ویٚنە (فلو –لیٚل) دەبیٚت ، ویٚنەکە دەسوریٚ

٢٤ – (Big Close Up)دەسرۆکەی سەرچۆپی کیٚش لەگەڵ ویٚنەی پیٚشوو (Dissolve) دەبیٚت .

دەنگ (قریوەو دەهۆڵ‌و زورنا) .

٢٥ – (Close Up)دەم‌و چاوی کاکل . کامیٚرە (Tilt Pown) دەبیٚ .

٢٦ – (Close Up)دەست دەداتە تفەنگەکەی و بڵندی دەکات .

دەنگ : کاکل / چۆن شتی‌وا ئەبیٚ .

٢٧ – (Long Shot)هەورو ترۆپکی چیاکان .

جولاٌنەوەی بازنی‌ی . .

**بینراو (٢)**

کات / رۆژ – ویٚنە / دەرەوە

شویٚن / فۆتۆ / مۆنتاژ.

١ – کامیٚرە لە داویٚنی چیایەکی بڵندەوە ویٚنە دەگریٚ (Tilt Down) زۆر بەشیٚنەیی دیٚتە خوارەوە ، لە رەق‌و تیژی چیاو بەردەکانی‌و لیٚژیەکەیدا مەبەستە سایکۆلۆژیی‌یەکە دەگەیٚنیٚ . (Zoom in) لە ریٚگایەکی پیٚچەوە کاکل بەسواری دەردەکەویٚ . لە پیٚشا سەری ئەسپەکەی (Close Up)پاشان سەری کاکل .

٢ – کاکل ئەسپەکەی تاو داوە بەناو دۆڵ‌و هەردا رادەبووریٚ .

کامیٚرە (Fade out)و (Fade in) دەکات .

٣ – کامیٚرە بە (Zoom in)کاکل دەردەخات . تۆز دەکات پاشان (Wipe)لادەچیٚ .

٤ – (Long Shot)رووبار **(کامیٚرە رووی لە پشتی** رووبارەکەیە .

٥ – (Medium Shot)کاکل بەسواری **ئەسپەکەیەوە** رووبارەکە دەبریٚ . (کامیٚرە لەگەڵیا ریٚ دەکەویٚ) .

٦ – (Close Up) – کاکل لە روبارەکەدا دەردەکەویٚ .

(فلاش باك – Flash back)

ئاوەکە روون ئەبیٚتەوە (کامیٚرە بەرز ئەبیٚتەوە)–Tiltup (گویٚ‌کانیاویٚك) کاکل‌و کاڵیٚ دانیشتوون . Zoom inکاڵیٚ ئاو ئەکاتە گۆزەکەی .

دەنگ : کاکل / کاڵیٚ گیان ، گلارەی دیەکەم دڵ لە دڵ نەیەی . ئەوە نەم پیٚ ناچیٚ هەر کە لە راوەکە گەرامەوە ، بەدەست‌و دیاری‌یەوە ئەچمە خزمەت باوکت‌و خوازبیٚنیت ئەکەم .

کاڵیٚ / باشە بەقوربان . لە ئەمانی خواو پیٚغەمبەرو چاکانابی .

کاکل / وەك پیٚم ووتی

کاڵیٚ / پشت بەخوا بەسەلامەتی دەگەریٚتەوە

کاکل / دەبا جاریٚکی تریش لەو چاوە گەشانە بروانم

کاڵیٚ / نیازی چیت هەیە ؟

کاکل / تویشووی سەفەرمە .
٧ – (Complet Shot)هەڵئەسنە سەرپێ . کاکل خۆی هەڵئەداتە سەر زینەکەو ئاو زەنگی لێئەدات . (کامێرە لە دواوە رەوتی ئەسپەکە پیشان دەدات) . (Fadeout)
٨ – (Long Shot) – (Fad in) ڕووبەڕووی ئەسپەکە دەکرێتەوە .
٩ – (Medium Shot)لە روبارێکا کاکل بەسەر ئەسپەکەیەوە دەردەکەوێ ، کامێرە بڵند دەبێ کاکل بەئەسپەکەیەوە لە کادر دەردەچێ . .

**بینراوی (٣) :**

کات – ئێوارەیە . شوێن – گوندەکەیە وێنە – دەرەوەیە .
١ – لە دوورەوە گوندێك دەردەکەوێ . (Zoom)دوکەڵ لە هەیوانی ماڵێکەوە بەرز دەبێتەوە . بەرە بەرە ئاوایی یەکە دەردەخات (Zoom Out) . کامێرە ڕادەوەستێ . کاکل بەسواری ئەسپەکەیەوە دێتە کادرەوە . (لە خوارەوە) .
٢ – (گشتی) مەڕو ماڵات دێنەوە ئاوایی (باعە باع) .
٣ – بەیەك گەیشتنی خەڵکیو (ماندوو نەبوونی لەیەك کردن) .
٤ – (Long Shot)مزگەوتی ئاوایی . (بانگ) (Super)
٥ – (Medium Shot)کاکل بەسواری ئەسپەکەیەوە سەر بەرز ئەکاتەوە .
٦ – (Long Shot)کاکل لە ماڵەکانی ئاوایی ئەڕوانێ .
دەنگدانەوەی دەنگی ئاهەنگی دەهۆڵ و زورنا)
(Zoom in)سەربەرز ئەکاتەوە (کامێرە نیوە بازنەیەك بەدەوریا دەسورێ ، کاڵێ لە هەیوانی ماڵەکەیانەوە دەردەکەوێ ، خەریکی داگیرسانی چراکەیە – (کامێرە ڕاوەستاوەو کاکل ڕووەو کاڵێ دەڕوا) (Zoom out) .
٧ – (Close up)ڕووی کاکل بەسەر ئەسپەکەوە ، لە کاڵێ ئەڕوانێ (بەبێ تروکاندن) .
٨ – (Complet Shot)کاکل بەسواری ئەسپەکەیەوە کۆڵانە تەنگەبەرەکانی ئاوایی دەبڕێ . کاڵێ لە هەیوانی ماڵەکەیاندا ڕاوەستاوە .
٩ – (Close Up)چراکە لەبەر ڕووی لادەداو لە کاکل دەڕوانێ . (Zoom Out)کاکل وردە وردە لێی نزیك دەبێتەوە ، هەردووکیان دەچنە کادرەوە .
١٠ – (Close Up)دەمو چاوی کاڵێ کە لە کاکل دەڕوانێ .
١١ – (close up).دەمو چاوی کاکل کە لە کاڵێ دەڕوانێ .
١٢ – (Medium Shot)کاڵێ واق ورماوە نازانێ چی بکات چراکەی لە دەست بەرز ئەبێتەوەو بەرەو ژوورەوە ڕادەکات
١٣ – (Close Up)چرا شکاوەکە .
١٤ – لەگەڵ وێنەی گۆزەیەکی شکاو (Dissolve)دەبێ .
١٥ – (فلاش‌باك) ڕێگای کانی‌یە : دەنگی پێکەنینی چەند کیژێك :
١ – ناهەقی نی‌یە لێی مەگرن .
٢ – هیچ ئاگای لای خۆی نەماوە
کاڵێ : نازانم ، زۆر ئەترسم ، دڵم خەبەری داوە
١ – دوێنێش لەسەر شەخسەکە هەرنیگەران بوی .
١٦ – کامێرە (Tiltup)بەرز ئەبێتەوە – Zoom in – بەسەر پاڵێکەوە دارو شەخسێ پیشان دەدات .
١٧ – (کاڵێ) (Close Up)سەرپۆشی بەسەریا داوەو دەستی نزای بەرز کردۆتەوە . بەردێکی بچکۆلە بە کێلی گۆڕەکەوە ئەنێ . بەردەکە بەر ئەبێتەوە ، ڕائەچڵەکێ دەنگی بەردەکە دەنگ دەداتەوە . (Wipe)
١٨ – تاوێرە بەردی لەبن دەستی ئەسپەکەی کاکل‌وە تل دەبێتەوە ، گل ئەدا لەسەر چەقی ڕێگای ئاوایی ئەوەستێتەوە .

**بینراوی (٤) :**

کات : شەوە . وێنە : ناوەوەیە

شوێن : دیوەخانی ماڵی کوێخایە .

١ – (Zoom Out)خەریکی دەست هەڵگرتن لە نان خواردن

مەلا : ئەلحەمدوللەو شکر .

کوێخا : ئاکورە وەرن بەزیادی کەن ، چا بێرن .

مەلا : یاخوا خێری پێوەبێ .

هەموان : ئامین .

مەلا : خوا فەرموویەتی فانکحوا ما طاب لکم من النساء مثنی وثلاث ورباع «صدق الله العظیم» ،

کوێخا : کورد وتوویەتی پارویەك لەدەم بەربێتەوە بۆ کۆش ڕەوایە . منیش حەزم بەم خزمایەتیە کردو حەزم کرد توندو تۆڵ تری کەم .

حاجی : کوێخا پیاو کە کەمێ بەساڵا چوو هەقە ژنێ تربێنێ .

کوێخا : (بەپێکەنینەوە) ئەزانم لە کوێ وەقسە ئەکەی دەی پەلی خۆت بهاوێژە . (هەموو پێ‌ئەکەنن)

مەلا : کاتمان درەنگ کرد با ناوی خوای لێ بێنین کوێخا ماڵت ئاوابێ بەدوعا .

حاجی :. بەڵێ مامۆستا بەم تاکە دەعوەتە وازناهێنێن

مەلا : خوا کەریمە ، خوا حافیز .

(ئەچنە دەرێ) (Cut) .

**بینراوی (٥)** :

کات – ئێوارەیە – شوین – گوندە .وێنە : دەرەوەیە .

١ – (Close Up)کاکل جڵەوی ئەسپەکەی بە دەستەوەیەو بە دوای خۆیا رای ئەکێشێ تا ئەگاتە بەرماڵی خۆیان ، ئەسپەکە ئەبەستێتەوە سەربڵند ئەکاو ئەروا .

لە دوورەوە دەنگی گۆرانیەکی فوڵکلۆری ئەبیستێ .

(کەوی یانی کەوباریەی – یا گوڵی لالەزاری من شێخو مەلا کۆوەبوون – وا کەژاڵێ دەدەن بەمن) .

**بینراوی (٦)** :

کات / شەوە . شوێن / گوندە . وێنە / ناوەوەیە .

ژوری ماڵی کاڵێ ، هەمان کەسانی ماڵی کوێخا ، خوازبێنیو دەست ماچ کردنە ! دەنگی گۆرانی : (هەمان گۆرانی پێشوو)

**بینراوی (٧)**

کات – ڕۆژە . شوێن – گوندەکەیە وێنە – ناوەوەیە .

(Close Up)ماڵی کاڵێ : کاڵێ ئەگریو سەر پۆشێکیان بەسەرا داوەو مەلا لەو دیو دەرگاوەو ئەمیش لەگەڵ چەند ئافرەتێ لەم دیوەوە :

مەلا : کچم بڵێ رازیم (Close Up)

کاڵێ : Close Up . . . ئەگری

مام حەسەن : ئەوە شەرم ئەکات ، قسە بکە .

پیرێژن :– کچێ شورەیی‌یە ئەو عەشاماتە مەحتەل مەکە ١٠

کاڵێ :– نا . . نا . . .

مام حەسەن : جەنابی ماموستا رخسەت بفەرموو (ئەچێتە ئەو دیو)

مام حەسەن : ئەوە بۆ زمانت لە دەما نەماوە ، هەی دارزیێ

پیرێژن : ئەڵێ رازیم . . .

مام حەسەن : رازی‌یە . . ئێ جەنابی مامۆستا ناوی خوای لێ بێنە .

مەلا : موبارەکە . . (Cut) .

**بینراوی (٨)**

کات / ئێوارەیە . شوێن / گوندە . وێنە / دەرەوەیە .

کاکل بەرەو چیاکە دەروات ، بەرە بەرە دەنگی گۆرانی شوانەکە بەرز ئەبێتەوە .

**بینراوی (٩)**

کات / ڕۆژە . شوێن / گوندە . وێنە/ ناوەوەیە .

١ – دەست ماچ کردن .

٢ – Close Up مامۆستا : الفاتحە .

هەموو دەست بۆ فاتحە خوێندن بەرز دەکەنەوەو کامێرە بەرز ئەبێتەوە (Til Up) .

**بینراوی (١٠)** :

کات / شەو / وێنە / دەرەوەیە .شوێن / لە قەد چیایەك .

١ - Medium Shot : شوان خەریکی گۆرانی وتنەو کاکل دێتە ناو (کادرەوە)و

کاکل : چۆنی کاکەی شوان

شوان : خوا چاکمان بۆ بکا . دەستەکانت ماچ دەکەم وەرە دانیشە .

کاکل : خۆزگەم بەدڵت

شوان : هێشتا چاکە گەرمە با چایەکت بۆتێ کەم ؟

کاکل : کاتی چانی یە ، دڵم نایبات نەوەڵا نایەکم بۆ بژەنە .

شوان : وەبان هەردوو دیەم

کاکل : دیەت خۆش بێ .

٢ - Close Up : شوان.: دەست بەنای ژەندن ئەکات لێرەدا کاکل (Big Close Up)پاشان چاوی لەگەڵ دیمەنی درەختو چیاو گوندەکەدا تێکەڵ ئەبێ (Dissolve) (خەیاڵ ئەکاتەوە) .

**بینراوی (١١)** :

شوین : قەیسەری نەقیب . وێنە : دەرەوە . کات : رۆژە .

وێنەو دەنگی ناو بازارەکە تێکەڵ بەوێنەی خەیاڵ کردنەوەکەی کاکل دەبێ : وێنەی کاکل نامێنێ‌و دوکانی بازرگانێ دەردەکەوێ

١ - Pan Pight : دوکانەکە دەردەخات .

٢ - **ئافرەت** : Close Up : ئا خاڵە گیان لەو مۆرەش .

بازرگان : حەوت گەز .

**ئافرەت** : ئا خاڵۆکەم .

**(٢) - ئافرەت** :-بایەك دوو مەتر لەو برنجۆکە ئاڵەش دانێ .

**(١) - ئافرەت** : بۆ تارا .

**(٢) - ئافرەت** : ئەی بۆ حەبەلی سوورنەبێ ؟ یان قەیناکە .

بازرگان : پیرۆزبێ . . (دا دەدرێ) .

**بینراوی (١٢)** :

شوێن : لە دیار مەرو ماڵات . وێنە : دەرەوەیە .

کات : شەوە .

وێنەی بینراوی پێشەوە لەسەر چاوی کاکل تێکەڵ دەبێ . پاشان کە روون دەبێتەوە کاکل هەڵئەسێ :

شوان : ها کاکە کاکل خێر ؟

کاکل : خوا حافیز

شوان : ئەترسم نایەکەمت بە دڵ نەبووبێ

کاکل : چۆن بە دڵم نابێ ، خۆزگە بەخۆزگای خوا هەموو شتێ وەك ئەو نایەی تۆ بەجوانی دەمایەوە بەس نی یە کەس ناتوانێ ئاوازەکان لەگەرووت بدزێ .

شوان : (سەر ئەلەقێنێ) تێ‌گەیشتم . خوا دەست بەباڵتەوە بگرێ .

(بەرەبەرە کاکل بەرەو ئاوایی دەروا تا وون دەبێ)

**بینراوی (١٣)** :

کات / شەوە . وێنە / ناوەوەیە شوێن / چایخانەی ئاوایی .

١ - Close Up - ئاگری‌وەجاخەکە (Zoom in)پاشان چایچی دەردەکەوێ . کامێرە بەدەمو چاوی دانیشتوانەکاندا دەگەرێ (Pan) .

مامۆستا : شتەکە زۆر روونو ئاشکرایە ، دەبوو هەر زوو هەستمان پێ بکردایە ، بە خۆرایی کورد نەی وتووە مانگەشەو سەر لە ئێوارە دیارە .

کابرایەك :- ئێ باشە خۆ عومری باپیرەی‌ی هەیە .

مامۆستا :- هەموو شتێکی چەوتو ناقولاً لە ریگای چەوتو چەویلاً ئاسایی یە . بەلاًم بەگیانی باوکی ئەو جۆرە ژن هێنانە ، هەر تەماعو مەرامێك پی‌ی کردبێ ئەوە پەشیمانیو پەنجە گەزتنی چیم بە خۆم کردی لە دوایە .

یەکێك :- ئەرێ ئێوە بۆ سەری خۆتان دێشێنن . ئەمە

قسمەت و نسیبە ، وبڕایەوە ، وا لە چارەیان نووسراوە قەڵەمەکە وای لێ داوە .

مامۆستا :- لالۆگیان خوا عەقڵی پێ داوین و ئەو نووسینە ئەو عەقڵەوەیە . هیچ کاتێ بیانوو بۆ نارەوا مەهێنەرەوە . خوا نەفرەتی لە نارەوا کردووە

لالۆگیان عەقڵ بنچینەی هەموو شتێکە .

چایچی :- کاکە گیان ، کابرا مەصلەحەت چی یەو خێری تێبینی وە چاکی ئەناسم ، بەخوا بەلای دیوارێکا بڕوا خشتێکی ێ لە باخەڵ ئەنێ ، ئەوە چۆنی ئەناسن .

مامۆستا :- جا باشە کەوای ئەناسن ئەی بۆ کەناری لێ ئەگرن یان ئەوەتا کەس نایەوێ خۆی تێوە گلێنێ ، هەموو هەمواریەك لە مەوە دەست پێ ئەکات هەر یەکە :

ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە . هەمووشیان هەقیان ئەوی و بەمە قەد ڕازی نین هەق بەناحەق بدەین ئەگەر دونیا ئۆغرۆ بووە .

یەکێك : کاکی خۆم ڕێکەوتە ، ڕێکەوت

مامۆستا : ئەی کاکڵ و کاڵێ . ها ؟ جار بە جەهەنەم !

**بینراوی (١٤) :**

کات : شەوە - دەرەوە شوێن : بەرپەنجەرەی چایخانەکە وێنە : دەرەوەیە .

١ - Medium Shot - کاکڵ لەبەردەم پەنجەرەکەدا ڕاوەستاوە . بەشێنەیی ڕووەو ماڵ دەبێتەوە . (کامێرە لەگەڵیایە) ، (پاشان کامێرە ڕادەوەستێ و کاکڵ لە کادرەکە دەردەچێ) .

**بینراوی (١٥) :**

کات / شەوە ، ناوەوە . شوێن / ژووری کاڵێ یە ،

١ - Pan - کامێرە ژوورەکە پیشان دەدات ، دەچێتە سەر جێگاکەی کاڵێ . .

٢ - کاڵێ خەوتووە . . . . . بەدەم خەوەوە دەکەوێتە سەر پشت . . چاو هەڵدەێنێ و بە ژوورەکەیدا دەگێڕێ . . . .

لە خەو هەڵدەستێ . . هەڵدەستێتە سەرپێ . . . . .

ڕووەو دەرگای ژوورەکە دەچێ . .

**بینراوی (١٦) :**

کات/ شەوە - دەرەوە . شوێن / گۆرستانە .

تێبینی / ئەم بینراوانەی کاڵێ بەشێوەی (موازی) لەگەڵ بینراوە خەونی یەکانی کاکڵدا دەڕوا .

١ - کاڵێ بە بێ ئاگایی یەوە ڕووەو گۆرستانەکە دەبێتەوە

٢ - دەگاتە گۆرستانەکە . . . دەیەوێ بڕواو لە پڕا ڕادەوەستێتەوە . . . چاو دەگێڕێ . . . لە ئارامگای (چاکەکە) نزیك دەبێتەوە .

٣ - کامێرە دەشتێکی لە تەنەکە دروستکراو دەردەخات کە چاوێك لە ناوەڕاستەکەیدایە .

٤ - بەیداخێك دەشەکێتەوە .

٥ - دەم و چاوی کاڵێ . .

٦ - (کامێرە لەپشت کاڵێ وەیە . . . کێلی گۆڕێك Zoom (Out شانی کاڵێ ، Zoom in بە هێواشی بۆ گۆڕەکەو (عدسە) . Out Foraus

**بینراوی (١٧) :** (کاکڵ خەون دەبینێ) .

١ - Medium Shot دەم و چاوی کاکڵ بە نووستوویی ، ئەم دیوو ئەو دیوو دەکات ، کامێرە قووتیلەیەك پیشان دەدات ، بەلای دەرگای ژوورەکەوەیە ، ئاگرەکەی بەهەمان شێوەی سەری کاکڵ ئەم لاو ئەولا دەکات . هەردوو وێنە دەچنە سەریەك (Disso Lve)

**بینراوی (١٨) :** (خەون)

١ - Long Shot لە دوورەوە کاکڵ دەردەکەوێ خەریکی جووت کردنە ، کامێرە ڕووەو خۆرەکە کە خەریکە گزنگ بدات .

٢ - Close Up - گاسنەکەی لە زەوی گیربووەو دەیەوێ دەری بهێنێ ، دەوەستێتەوەو ئارەقەی ناوچەوانی دەسڕێ .

٣ - Complet Shot) - کامێرە لەدەمی گاسنەکەوە بەرەو

سەری کاکل دەروات Tilt Up .
٤ – Complet Shot – کاکل خەریکی کارکردنە .
٥ – Close Up – دەچێتە سەر گاسنەکە – گاسن ناجووڵێ وەك لە شتێك گیربووبێ .
٦ – Medium Shotکاکل زۆر لەگاسنەکە دەکاو شتێك لە بن خاکەکەوە دەردەکەوێ .
٧ – Complet Shot – سەری کوپەڵەیەك دەردەکەوێ .
٨ – Big Chose Up (کامێرە لە ژێرەوەیە) چاوی کاکل دەردەکەوێ کە لە کوپەڵە دەروانێ .
٩ – (Complet Shot) (کامێرە دەسووڕێ) (Pan)بە دەوریی (کاکل)دا .
١٠ – Complet Shotرووی کاکل . سەیری چوار دەوری دەکاتو گەشکە دەیگرێ . ودەست بەپێکەنین دەکات . . قاقالێ دەدات . .
کاکل : ئەمە . . . تۆ بڵێی خوایە . ئەمە منو بەسەر کووپەی زێڕا کەوتووم . . .
چی بکەم . . . ؟ چی لێ بکەم . . . .
(Stop / Sader) وێنە رادەوەستێ .
دەنگ : زێڕ . . . زێڕ . . . .
دەنگی کاڵێ : سەیرمکە . . . کاڵێم
کاکل : کوانێ هیچ نابینم
کاڵێ : لەبەر دەمتنام
کاکل : نابینم
کاڵێ : کورە لاوە . . . من نابینێ ؟ . . کاڵێ‌کەی خۆتم
١١ – Complet Shot . دەستی ئەتەکێنێ . . .و پاشان چاوی هەڵئەگلۆفێ .
کاکل : ئەی بەر نەفرەت خوا کەوی زێڕو پارە .
**بینراوی (١٩) :**
١ – Medium Shotکاڵێ. لەپەنجەرەیەك نزیك دەبێتەوەو گوێ لە قسە دەگرێ .
یەکەم : ئەم کارە تووشی دڵە راوکێ‌ی کردووم .
دووەم : بۆ ؟
یەکەم : مەبەستم لەکاکلە .
٢ – Big Close Upرووی کاڵێ .
کوێخا / ئادەنگ بەرزکەنەوە . تا ئێمەش بزانین لە چیەوە ئەدوێن .
یەکەم / ئەڵێم قوربان . . کاکل . . . .
کوێخا/ دەمت داخە . . ئەوە باسی ئەوە ئەکەن . . بەخوا خاسە هەر ئەبێ ئەمشەو بکوژرێ .
٣ – Complet Shot – کاڵێ دەلەرزێو رادەکات .
**بینراوی (٢٠) :**
کات/ شەوە . شوێن / گوندەکەیە .
١ – Medium Shotفۆتۆ مونتاژ – کاڵێ بەرەو ماڵی کاکل رادەکات .
٢ – Complet Shotکاڵێ دەرگای ماڵی کاکل دەکاتەوەو دەچێتە ژووری (دەرگاکە دادەخرێتەوە کامێرە Shat)
**بینراوی (٢١)**
(ژووری کاکل)
١ – Medium Shotکامێرە ژوورەکە پیشان دەدات کاکل لە ناو پێخەفەکەیدایە . بەخێرایی دەرگاکە دەکرێتەوە . . کاڵێ دێتە ژوورەوە .
کاڵێ : (هاوار دەکات) کورە کاکل ماڵەکەت بەقوڕ نەگیرێ
٢ – Medium Shot –
کاکل : چی‌یە ! . . . چی قەوماوە ؟
(Zoom Out)کاڵێ دێتە کادێرەوە .
کاڵێ : دەیانەوێ ئەمشەو لە ناوت بەرن .
کامێرە (Zoom in)بۆ سەر رووی کاکل .(Cut)برین .
**بینراوی (٢٢) :**
١ – Fade in – Big Close Up – رووی کەسێك کە

دەماغی بەستوە لەگەڵ لولەی تفەنگێك دەردەکەوێ . . . .
لە چاوەروانیایە .
٢ – Medium Shot – کەسێکی تر لە سەری کۆڵانەکە
راوەستاوەو تفەنگێکی بەدەستەوەیە .
٣ – Camplet Shot – دوو کەسی تفەنگ بەدەست
رووەو ماڵی کاکل دەڕۆن .
٤ – Medium Shot – چەکدارێك پەلی چەکدارێکی تر
رادەکێشێ تا بەرەو پێشەوە بچن .
٥ – Camplet Shot – چەند کەسێك رووەو کامێرە دێن
٦ – Camplet Shot – لە دەوری پەنجەرەی ژوورەکەی
کاکل کۆ دەبنەوە .
٧ – Big Close Up – چەکدارێك لوولەی چەکەکەی لە
ژووری کاکل دەکات .
٨ – Close Up – پێخەفەکەی کاکل لەلای سەرەوە
دەردەکەوێ
٩ – Close Up – ئەو کەسەی نیشانەی لێگرتبووەوە چەند
فیشەکێك دەتەقێنێ .
١٠ – Close Up – هەریەکەو لەلایەکەوە هەڵدێ .
وێنە نامێنێ Fade Out .

**(بینراوی (٢٣**

١ – Medium Shot – شوانەکە بە سەری خۆیدا دەدات
دەنگە دەنگ‌و هات هاواری خەڵکی . .
شوان :– هاوار . . . خەڵکی ئاوایی . . . هاوار
٢ – Medium Shot – خەڵکەکە لە حەمەی شوان
کۆدەبنەوە (دەنگە دەنگ) . . . چی رووی‌داوە ؟ . . .
چی‌بووە .
٣ – Medium Shot – حەمەی شوان لە نێوانی
خەڵکەکەوە
شوان/ کاکلیان کوشت
هەموان / کاکل .

٤ – Complet Shot هەموان بەرەو ماڵی کاکل
رادەکەن .

**بینراوی (٢٤)**

١ – Medium Shot کامێرە رووەو دەرگاکەیە . دەرگا
دەکرێتەوەو خەڵکی خۆیان ئەکەن بە ژوورا . مەلای گوندەکە لە
پێشیانەوە .
دەنگی گریان‌و شیوەن دەبیسترێ .
مەلا :– انا لله وانا الیه راجعون . ولا حول ولا قوة الا بالله
العلی العظیم .
کامێرە (Pan) لەگەڵ مەلادا بەرەو سەری کاکل دەڕوا .
٢ Medium Shot – مەلا لێفەکە لەسەر کاکل
لادەبات . بەسەر سورمانەوە تەماشا دەکات .
(بێ‌دەنگی) مەلا : الحمد لله .
یەکێك : کاکل کوا ! ! ؟
٣ – Complet Shot – هەموویان بەسەر سامیەوە لە یەکتر
ئەروانن . . .
یەکەم : بۆ کوێ چوە ؟
دووەم : خوا دەزانێ .
٤ – Big Close Up – کامێرە لە پشت شوانەکەوە . بەرەو
پەنجەرەکەیە . . . .
حەمەی شوان لەپەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکات . .
شوان/ئەوەتا . . . خەڵکینە بروانن .
٥ – Complet Shot – (کامێرە لە شوێنی پەنجەرەکەوەیە)
گشتیان بەرەو کامێرەکە دێن‌و تەماشا دەکەن .

**بینراوی (٢٥)**

کات / بەیانە شوێن / چیایە
١ – Complet Shot – کاکل بەسەرپشتی ئەسپەکەیەوەیە
وکاڵێ‌ی لە پاشووی ناوەو بە چیاکەدا سەردەکەون رووەو ئەو
خورەی لە هەڵبوونایە . .
–کۆتایی–

له ئاسۆی هونەری جیهانی‌دا

## هونەرمەندی بلیمەتی ئەسپانی :

# ڤێلاسکس

نووسینی مێژوونووسی سۆڤیەتی : ڤ . کاپتیریڤا
وەرگێڕانو ئامادەکردنی له ڕووسی‌یەوه : محمد عارف

هونەرمەندی بلیمەتی ئەسپانی : (دیێگۆ ڕۆدریکێس دی سیلڤاڤێلاسکس) له ساڵی ١٥٩٩دا له شاری : (سێڤیل) له ئەسپانیا له دایك بووه . هەر له منداڵی‌یەوه بەهرەی هونەری سەرنجی باوکی ڕاکێشاوەو لەبەر ئەمه خێرا له ستۆدیۆی مامۆستایانی هونەرمەند : (ئیریرا)و (پاچیکۆ)ی داناوه .

ڤێلاسکس لەسەرەتای بەرهەمی‌یەوه ڕووی له ژیانی ڕۆژانەو بوونی دەوروبەرکردوەو بەراستی لەم ڕوانگەوه بووەته مامۆستاو ڕابەری هونەری نیگار کێشانی ئەسپانی . باشترین نیگاری ئەم قۆناغەی تابلۆی : (نان خواردنی بەیانی)یە ، کە له دەروبەری ساڵی ١٦١٧دا دروستی کردوه . ئەوەی شایانی باسە ، هونەرمەندی ئیتالی مەزن : (کارافوجۆ) کاری خۆی له ڕێبازی ڤێلاسکس کردوه ، بەڵام ئەوەندەی نەخایندووه خۆی لەم بارە رزگارکردووەو پشتی خۆی بە ناوەرۆکی دەوڵەمەندی له ژیان هەڵقولاوو بەڕێبازێکی هونەری تایبەت بەخۆی بەستوه .

ڤێلاسکس وەك هەموو هونەرمەندانی ئەسپانیا ، نیگاری ئایینی درووست کردوه ، بەڵام تەنانەت پاڵەوانەکانی ئایینیشی خەڵکی سادەو ڕەش‌وڕووتەکانی نیشتمانن . لەساڵی ١٦١٩دا ، ڤێلاسکس له پایتەخت جی‌نشین دەبی‌و دەکرێته نیگارکێشی کۆشکی شاهی ئەسپانیا : (فیلیپ)ی چوارەم .

لەوانه خەڵك بیری ئەوه بکەن کە ئەم ئیشەی هونەرمەند ، له زەمینەی کڵێسەو دەسەڵاتی ئایینی رزگاری کردبێ ! بەڵێ ئەمه تا ڕادەیەك ڕاستە ، بەڵام لەلایەکی‌ترەوه ، زەمینەی کۆشکی شاەو سیرەمونیای پێش‌وازی‌و بەری‌کردنو ئاهەنگ‌و ڕوواداوەکانی‌تر ، کاتێکی زۆری لەژیانی بە نرخی هونەرمەند ، بەفیڕۆ بردووه . هونەرمەند لەبەر ڕەوشت‌و خوو بەرزی‌و ڕاست گۆیی‌و دلێری ، ناویان ناوه : (هونەرمەندی ڕاستی‌ی) . بەڵام لەلایەکی‌ترەوه ئەم شتە بووەتە هۆی ئەوەی کە له لایەن هونەرمەندانی کۆنی کۆشکی شاهەوه ، بەوپەری ڕووگرژی‌و



ئاسنگەری ئاگر پژێن ١٦٣٠



ئافرەتێك هێلكەو ڕۆن دەكات ١٦١٨

دوژمنایەتی‌وە ، پێش‌وازی بكرێ ، بەتایبەتی لەلایەن نیگاركێشی ناو : (فیسێنت‌كاردوچۆ)وە .

لە ساڵی ١٦٢١دا هونەرمەندی مەزنی هۆڵەندی : (ڕووبنس) بە كارێكی دیپلۆماتی هاتوەتە مەدریدو گۆیا لەو كاتەی ڤێلاسكس نیگاری بە ناوبانگی : (ڤاكخ)ی درووست كردوە ، ڕووبنس تەماشای كردوەو چەند تێبینی‌و ئامۆژگاری‌یەكی بەنرخی پێش‌كەش ڤێلاسكس كردوەو زیاتر باسی سیستێمی ڕەنگ‌و چۆنیەتی دابەش كردنیانی كردوە . هونەرمەندی مەزن سوودێكی تەواوی لە ڕووبنس وەرگرتوە . ڤێلاسكس ، لە دوای پێشنیاری ڕووبنس ، گەشتێكی هونەری پڕ سوودی بۆ : (جەنەوا ڤینیسیا ، ڕۆماو ناپۆلی) كردوەو لە شاری ڕۆمادا نیگارێكی نایابی ناو : (ئاسنگری ئاگر پەژێن)ی درووست كردوە كە بووەتە جێی ڕێزو سەرسورمانی هونەرمەندە ئیتالی‌یەكان‌و بە هەنگاوێكی شۆرشگێڕانەی هونەری ژماردراوە كە لە چوارچێوەی تراژیدیای كۆن دەرچوەو

چەند بنكەیێكی تازەی دامەزراندوە . هونەرمەند پاش گەڕانەوەی بۆ نیشتمان كەمێك دەستكاری پالێتی هونەری كردوەو سیستێمی ڕەنگەكانی بەرەو تەنكی چووەو لە جیاتی پاشەكی‌ی تەخت‌و فلات دیمەنی سرووشتی داناوەو زیاتر پەیوەندی مرۆڤ ، مۆدیل‌و سرووشتی ڕەنگینی دۆزیوەتەوە .

لە گۆڕەپانی تابلۆی مێژوویی لەم قۆناغەدا ناوی نیگاری (تەسلیم كردنی شاری برێد) دەهێنین كە ناوەڕۆكی دەربارەی جەنگی ئەسپانی– هۆڵەندی‌یەو بەشێوەی كۆنی دەربڕینی جەنگ درووستی نەكردوە ، بەڵكو زیاتر لە ڕوانگەی تراژیدیای مرۆڤایەتی‌یەوە سەیری كردوە .

هونەرمەند لەساڵەكانی ١٦٣٠و ١٦٤٠دا زنجیرەیەكی نایابی پۆرترێتی هەمە جۆری خەڵكی ئەسپانیای دروست‌كردوەو بەشێوەیەكی ڕوخساری‌و دەروونی مۆدیلەكانی بەرجەستە كردوە . . هونەرمەند وەك زانایەكی دەروونی سەیری ڕوخساری دەرەوەی كردوەو زۆر چەكی هونەری بۆ ئەم پڕۆژە مەزنە



ئاوفرۆش نزیکەی ١٦١٩

ناردراوەتە رۆما بۆ کرینی کۆمەڵە تابلۆیەك . هونەرمەند لە ماوەی مانەوەیدا چەند پۆرتریتیکی دروستکردوە . لە نێوان ئەمانەدا پۆرتریتی پاپای رۆما . پاپا کە سەیری پۆرتریتەکەی کردوە سەری سورماوەو گوتویەتی : (بەراستی ئەوە منم) . بۆیە هونەرمەندی خەلات کردوەو زنجیرەکی زێری لەمل کردوە .

رەخنەگرەکان بەرهەمی هونەرمەند لە پەنجاکاندا بە لووتکەی هەرە بەرزی نیگارەکانی دەژمێرن . لەراستیدا بەرهەمی ڤێلاسکس نەوەك تەنیا (سەدەی زێرینی هونەری نیگارکێشانی حەڤدەمینی ئەسپانیایە ، بەڵکو سەدەی زێرینی هونەری ئەوروپیو جیهانیش بەرجەستە دەکات) .

ڤێلاسکس چ جۆرە سکێچێکی ئامادەیی بۆ نیگارەکانی نەکردوە ، بەڵکو یەکسەر بەرەژوو یان بەفلچە دەستی بە نیگارەکانی کردوەو بەرەبەرە تەواوی کردون ، بەلام لەبەر پڕ رەنگیو راستگۆیی دەربڕینیان وەك بلێی بە (یەك پشوو) تابلۆکانی تەواو کردوە . هونەرمەند لە ساڵەکانی ١٦٥٦و ١٦٥٧دا سێ نیگاری هەرە بەناوبانگی درووست کردوە ئەمانەش : (ڤینۆسی)و (مێنینا)و (ئافرەتەکانی خوری رێس) .

چارەسەرکردنی رەنگو دۆزینەوەی داهێنەرانەی ئەم نیگارە کە تیشك دەخاتە سەر (بەهرەی خەڵکی ساکار) ، ئەو بەهرەیەی کە دەبێتە جوانترین بەرهەمی هونەریی وەك ئەو مافورە نایابانەی لەلایەن ئەم ئافرەتە هەژارانەوە درووست دەکریو مالێ شاهو دەوڵەمەندەکانی پێ دەرازێندرێتەوە . نیگاری باسکراو دوا بەرهەمی هونەرمەندی بلیمەت بووە . ڤێلاسکس لە شەشی ئابی ساڵی ١٦٦٠دا کۆچی دوایی کردوە . هونەرمەند کارێکی مەزنی لە مێژووی هونەری ئەسپانیو ئەوروپیو جیهانی کردوە ، بوەتە رابەری هونەرمەندە ریالیستەکانی فەرەنسی سەدەی نۆزدەم . هونەرمەندانی رووسی : (کرامسکۆی ، سوریکۆف ، رێپینو سیرۆڤ) پەری رێزو خۆشەویستیەوە ناویان هێناوەو سوودیان لە بەرهەمە نەمرەکانی وەرگرتوە .

بەکارهێناوەو پشتی خۆی بە هەڵبژاردنی جۆری دانشتن : (پۆز) ، دینامیکیەتی هێلو فۆرما . پلاستیکیەتی هێلی دەرەوە (OUT – LINE) ، دامەزراندنو ئەندازە راستەکانی مۆدیل ، بەستوەو تەنیا لە کۆتاییدا رووی کردوەتە دۆزینەوەی سیستێمی رەنگ رۆناکیو تاریکیدا ، کە بێگومان لەم مەیدانەشدا شۆرە سواری زەمانی خۆی بوە . ئەوەی شایانی باسە مۆدیلەکانی هونەرمەند هەرچەند جلك وبەرگیان جوانو قەشەنگو بریسکەدار بوویو بەزێرو زیو رازاندرابویتەوە ، بەلام بایەخی بە مرۆڤ ، باری دەروونیو جیهانی ناوەوەی نەبینراوی داوە . بێگومان چارەسەرکردنی ئەم کێشە هەرە سەختە واتە (دەربڕینی جیهانی ناوە بێئەوەی فۆرمای دەرەوەو روخساری بینراو بشێوینی) ، هونەرمەندی مەزن وەستایانە جێبەجێی کردوەو بەوپەری تواناوە زاڵ بووەتە سەری . هونەرمەند بایەخێکی تەواوی بەو هەژارو کۆمیدیانە داوە ، کە لە ئاهەنگەکانی کۆشکی شاە ئیشو کاریان ئەوە بوە خەڵك بەپێکەنین بهێنن .

ڤێلاسکس لە ساڵی ١٦٤٩دا لەلایەن شاهی ئەسپانیاوە

# تیۆرەکانی مۆسیقا

سەلاح رەوف

● **مۆسیقا لەچی پێك‌هاتووە :-**

مۆسیقا بەهەموو وێنەکانیەوە لە دوو توخمی سەرەکی پێك‌هاتووە کە ریتم (ایقاع)وئاوازە (اللحن) ئەم دوو توخمەش بەئاسایی لە مۆسیقای رۆژهەلاتیدا دەرئەکەوێ بەلام لە موسیقای ئەوروپی‌دا توخمێکی دی هەیە کەپی‌ی ئەوترێ هاودەنگی (الهارمۆنی) بەلام لەبەرئەوەی لەپەروەردەی مۆسیقاییدا بەزوری گرنگی بەو دوو توخمەی یەکەم ئەدا بۆیە ئێمەش لەسەرەتادا هەر باسی ئەو دوانە ئەکەین .

**أ - ریتم (الایقاع) :**

ریتم یان کێش بریتی‌یە لە پەیوەندی دەنگە مۆسیقایی‌یەکان یەك بەوی ترەوە ، لەروی بەردەوام بوونی هەریەکەیان لەبابەت درێژی‌و کورتی مەوداو کاتی ئەو دەنگە مۆسیقاییانە .

ب - ئاواز (اللحن) : بریتی‌یە لە پەیوەندی دەنگەکان یەك بەوی ترەوە ، لەروی ناسکی‌و گری‌یەوە .

ئەم دوو توخمەسەرەکیە شان بەشانی یەك ئەرۆن‌و بەهەردوکیان مۆسیقا دروست ئەکەن .

**- نوسینەوەی نۆتەی مۆسیقا-**

**(التدوین الموسیقی) :**

هۆی وون‌بوونی ئەوکەلەپورە مۆسیقایی‌یانەی کە لەسەرەتادا لەولاتی نیوان دوو روبار (بلاد مابین النهرین)و ـ میسرو هیندو چین‌و یابان‌و یونانی‌و رومانی‌یە کونەکان ئەگەرێتەوە بۆ نەبوونی چونیەتی نوسینەوەی نۆتەی مۆسیقایی . ئەوگۆرانی‌و مۆسیقایی‌یانەش کە هەبوون‌و تا ئیستاش ماون لەسەر زمانی نەوەیەکەوە بۆنەوەیەکی دی گەیشتوە ئەویش ئەوگیرمەو کیشانە بووە کەبەسەر ئەو نەوانە هاتوون .

ئەوەی شایانی باسە لە سالی (١٩٧٤)زدا کۆمەلێ پارقور لە عیراق‌و سوریا دوزراونەتەوە ، کە لە شێوەی نوسینی بزماریدایەو دوای لی‌کولینەوەیەکی زۆر دەرکەوت کە شێوەیەکە لە نوسینەوەی زمانی مۆسیقای کۆن . بەلام یۆنانی‌یەکان مۆسیقاو گۆرانیەکانی خۆیانیان بەشێوەیەك لە فەوتاندن رزگارکردوە ، بۆیە پیتەکانی ئەلف‌و بای زمانی خویانیان بەکار هێناوە بەشێوەیەك دەرکیان بەبەرزی‌و نزمی پلەی دەنگی مۆسیقاکەیان کردووە ، دوای ئەوانیش رومانیەکان سوودیان لەهەمان رێگا وەرگرتووەو حەوت پیتی ئەلف‌بای لاتینی‌یان بەکارهێناوە بۆ هەر حەوت دەنگە مۆسیقاییەکە .

دەنگەموسیقای‌یەکان بەلاتینی :-

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| A | B | C | D | E | F | G |
| لا | سی | دۆ | رێ | می | فا | سۆل |

**ناوی دەنگەکان :-**

لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا لامباردیەکان (اللامباردیون) لەسەروی ئیتالیا شێوەیەکی نوێیان بەکارهێنا بۆ نوسینەوەی نۆتەی مۆسیقایی ، کە بریتی‌بوو لەچەند هێمایەك‌و چەند هێلێکی پیچاوپێچ کە لەسەر ووشەی گۆرانیەکان ئەیان نوسی بۆئەوەی گۆرانی بێژەکان ، یان ئامێرژەنەکان بزانن لەچی پلەیەکی بەرزیدان . ئەم رێگایەش بە(نویما) ناونرا .

ئەم شێوەیە بەردەوام بوو لەگەل ئەورێگە کۆنەی کە باسمان‌کرد (بەکارهێنانی پیتی زمانەوانی) تاکو سەدەی دەیەمی

زاینی . تا زانا مۆسیقای‌یەکان شێوەیەکی دی‌یان دوزی‌یەوە . ئەویش بریتی‌بوو لە کێشانی هێڵ لە سەرەتادا هێڵێکی سوریان کیشا کە بریتی‌بوو لە پلەی دەنگی (فا)و هێمای (نویمات)یان لەسەر دائەنا بۆ دەست‌نیشان کردنی بەرزی‌و نزمی دەنگە مۆسیقای‌یەکان ، لەدوای ئەوە هێڵێکی تریشیان کێشا بەرەنگی زەرد کە دەست‌نیشانی پلەی دەنگی (دۆ)ی دەکرد . بەواتا پلیکانەی مۆسیقابوو بەدوو هێڵ . لەم دوو هێڵەشەوە تەواوی پلیکانەی مۆسقا دوزرایەوە ، بەلاّم لەراستیدا ئەم شێوە نوسینە بەتەواوی دەست‌نیشانی هەموو دەنگە مۆسیقای‌یەکان‌و کاتەکانی (المدد الزمنیة) نەئەکرد . ئەتوانین بلّێین کاتەکانی مۆسیقا بەتەواوی گوێ‌ی پێ نەدرا بوو . لەبەر ئەوە زانا مۆسیقای‌یەکان بیری تەواویان لە دۆزینەوەی ڕێگای چاکتر ئەکردەوە بۆ نوسینەوەی نۆتەی مۆسیقا . لێرەشدا نابێ ئەوە لە یادبکەین کە کەنیسە تاچی رادەیەك دەورێکی بالاّی هەبووە لە پەرەپێدانی زانستی مۆسیقا . هەروەها چۆن راهیبی ئیتالی بەناوبانگ (جیدۆ ئەرتیزۆ) بیری ڕێك‌و پێك کردنی دەنگە مۆسیقای‌یەکانی لەسەر پلیکانەی مۆسیقا هێنایە کایەوەو ، بەردی بناغەی نوسینەوەی نۆتەی مۆسیقای دانا لەسەر پلیکانەی مۆسیقا لەسەدەی یازدەهەمی زاینی‌دا .

**٨ خشتەی نمونەی نوسینەوەی نۆتەی مۆسیقا بەرێگای (نویمات)**







لەسەر ئەنجامی ئەو شتانەی باسمان کرد . لە سەدەی شازدەهەمدا تەواوی نوسینەوەی نۆتەی مۆسیقا دۆزرایەوەو تا ئێستاش هەمان ڕێگا لە جیهاندا بەکاردێت .

**● ناوی دەنگە مۆسیقایی‌یەکان**

**(اسماء الاصوات الموسیقیة)**

دەنگە مۆسیقایی‌کان پێك‌دێن لە حەوت دەنگی یەك لە دوای یەك لە چەپەوە بۆ راست ئەخوێنرێنەوە : بەم شێوەیەی خوارەوە .

لە زمانی ئەڵمانی‌دا بەم شیوەیە دەخوێنرێنەوە C d e f g h r

لە زمانی ئینگلیزی‌دا بەم شیوەیە دەخوێنرێنەوە c d e f g a b

لە زمانی ئیتالیدا بەم شیوەیە دەخوێنرێنەوە do re mi fa sola si

لە زمانی فەرەنسی بەم شیوەیە دەخوێنرێنەوە ut re mi fa so La si

لە زمانی عەرەبی بەم شیوەیە دەخوێنرێنەوە سی لا سول فا می ری دو

لە زمانی کوریدا بەم شیوەیە دەخوێنرێنەوە سی لا سۆل فا می رێ دۆ

**● پلیکانەی مۆسیقا (المدرج الموسیقي) STAVE**

پێك‌دێت لە پێنج هێڵی راستی ئاسۆیی (افقي) بە ئەندازەی

یەك . چوار بۆشایی‌یان لە نیواندایە . لە ژێرەوە بۆ سەرەوە ئەبژێررێن وەکو لەم وێنەیەدا :—

ناوی بۆشایی‌یەکان — ناوی هێڵەکان



هەر هێمایەك (نیشانەیەك) لە هێماکانی کاتی مۆسیقا کە لەسەر ئەم هێڵ و بۆشایی‌یانە دانرا ئەتوانرێ دەست نیشانی ناوی دەنگە مۆسیقای‌یەکان بکات . بەگوێرەی بەکارهێنانی کلیلی مۆسیقا وەکو لەم وێنەیەدا کە کلیلی (سۆڵ) مان بەکارهێناوە .

ناوی هێڵەکانی پلیکانەی مۆسیقا بە گوێرەی کلیلی سۆڵ

ناوی بۆشایی‌یەکانی پلیکانەی مۆسیقا بە گوێرەی کلیلی سۆڵ

ناوی هێڵ و بۆشایی‌یەکانی پەیژەی مۆسیقا بەیەکەوە .



هەروەها لەژێر هێڵی یەکەمەوە



هەروەها لەسەر هێڵی پینجەمەوە .



**● هێڵە زیادە یاریدەدەرەکان (الخطوط الاضافية المساعدة) :**

لەمەی پیشەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە تەواوی نۆتەکانی مۆسیقا ، یان ئەو نۆتانەی ئەمانەوێ بەکاریان بهێنین لەسەر پلیکانەی مۆسیقا جیگایان نابێتەوە . بۆیە بە پیویست زانراوە کە چەند هێڵێکی کورت لەسەر یان لەژێر پلیکانەی مۆسیقاوە بەکاربهێنرێ . جا ئەگەر ئەو کورتە هێڵانە لەسەرەوەی پلیکانەی مۆسیقاوە بەکارهێنران ئەوا پیێان ئەوترێ زیادە هێڵەکانی سەروو (الخطوط الاضافية العليا) وەکو لەم نمونەیەدا :

هێڵە زیادە یارمەتی دەرەکانی سەروو



گەر لەخواروی هێڵی یەکەمدا بوو . ئەوا پیێ ئەوترێ زیادە هێڵەکانی خواروو (الخطوط الاضافية السفلى) :

هێڵە زیادە یاریدە دەرەکانی خواروو



**● پلیکانەی مۆسیقای گەورەو دۆی ناوەندی (المدرج الموسيقى الكبير والدو الوسطية) :**

زانا مۆسیقایی‌یەکان هەوڵی ئەوەیان داوە کە ریگایەکی زانستی بنچینەیی بۆ نوسینەوەی نۆتەی مۆسیقا دابنێن . تا لەسەر شێوەیەکی بیرکاری چەسپاو بەجیٚی بهێنن بۆیە کۆششیان کردووە کە کەم‌ترین هێڵ لە نۆسینەوەی نۆتەی مۆسیقادا بەکاربهێنن کەمەرجی نوسینەوەی نۆتەی مۆسیقای تەواویان تیابێ .

جا یەك کەوتنیان لەسەر ئەوەبوو کە تەنها یانزە هێڵ بەکاربهێنین لە پلیکانەی مۆسیقادا کەوا بوشایی‌یان لەنیواندا هەیەو ناویان لەم یانزە هێڵەنا بەپلیکانەی مۆسیقای گەورە . کە لەشێوەی دوو پلیکانەی بچکۆلەدان . لە نیوانیاندا هێڵی (دۆ)ی ناوەندی هەیە . پێنج هێڵی خواروو بۆ دەنگە گرەکان بەکارئەهێنرێو کلیلی (فا)ی لەسەر دائەنرێ .

پێنج هێڵی سەرو کلیلی سۆڵی لەسەر دائەنرێو بۆ دەنگە بەرزەکان (تیژەکان) بەکار ئەهێنرێ . هێڵە ناوندیەکەش کە هەردوو پلیکانە بەیەکەوە ئەبەستی پلیکانەیەکی تایبەت بەخۆی دروست‌ئەکا . کلیلی (دۆ)یٚ لەسەر دائەنرێ . بۆ دەنگە مام ناوەندیەکان بەکاردێت . بەواتا دوو هێڵی یەکەمو دوەم لەپلیکانەی سەرو وەرئەگرێتو دوهێڵی چوارەمو پێنجەمی پلیکانەی خواروو وەرئەگرێت تا ژمارەی هێڵەکانی بکاتە پێنج هێڵ وەکو لەم وینەیەدا :







پلیکانەی گەورەی مۆسیقا توانای جێگابونەوەی زۆربەی زۆری دەنگە مۆسیقایی‌یەکانی هەیە کەزیاتر لە چوار پەیژە دەنگی مۆسیقا پێك‌هاتبن هەرچەندە گیرو گرفتی گۆرانی بێژی تەنها یان ئامێر ژەنەکان هەر وەکو خۆی مابوەوە . بویە بیری دۆزینەوەی کلیلە جۆربە جورەکانی مۆسیقا هاتەکایەوە . بۆ زیاتر ئاسان‌کردنی خوێندنەوەی نۆتەی مۆسیقا .

## ● بەهای کاتە سادەکانی نۆتەی مۆسیقا .

## (القیم الزمنیة البسیطة للنوطات الموسیقیة)

لە حەوت شێوەی جیاواز پێك‌دێن . هەر شێوەیەك نیشانەیەکی تایبەتی خۆی هەیە . نرخی کاتێك دەست نیشان ئەکا . ئەمانەش شیوەکانن .

| | ناوی فەرەنسی | بەکوردی | وێنەی نیشانەکە | نرخی کاتەکە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | رۆند | پڕ یان - خڕ | | کاتێکی تەواو کە پێك دێت لە چوار لێدانی مۆسیقای |
| ٢ | بلانش | نیو - یان سپی | | نیوەی کاتی تەواو دوو لێدانی مۆسیقای |
| ٣ | نوار | تاك یان رەش | | چارەکی کاتی تەواو یەك لێدان |
| ٤ | کرۆش | داندار یەکدان | | $\frac{1}{8}$ کاتی تەواو $\frac{1}{2}$ لێدان |
| ٥ | دبل‌کروش | دوودان | | $\frac{1}{16}$ کاتی تەواو $\frac{1}{4}$ لێدان |
| ٦ | تربل کروش | سیٚ‌دان | | $\frac{1}{32}$ کاتی تەواو $\frac{1}{8}$ لێدان |
| ٧ | کواتربل کروش | چواردان | | $\frac{1}{64}$ کاتی تەواو $\frac{1}{16}$ لێدان |

بەو خشتەیەی سەرەوەدا بۆمان دەرئەکەویٚ کە نیشانەی

رۆند درێژترین کاتەکانی مۆسیقایە . لەبەرئەوە پێی ئەڵێن کاتی تەواو (تەبا) کەواتە هەمو شێوەکانی دی لەم کەمترن‌و هەر یەکەیان بەشێکە لەوکاتە . کەواتە ئەتوانین بڵێین هەر کاتێك نیوەی کاتەکەی دوای خۆیەتی (بەپێی ئەو خشتەیەی کردومانە) هەروەها بەپێچەوانەشەوە هەر کاتێك دوقاتی کاتەکەی پێش خۆیەتی .

**تێبینی :**

بەکارهێنانی نیشانەکانی کاتی کۆسیقای لەسەر پلیکانەی مۆسیقا بەشێوەیەکی زانستی بەم جۆرەیە :

١ – نیشانەی رۆند لەبەر ئەوەی کلکدارنیە لەسەر هەر هێڵێك یان بۆشایی‌یەك دای‌بنێی گونجاوە .

٢ – نیشانەکانی دی لەبەرئەوەی کلکدارن ئەبێ بەم جورانە هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵدا بکرێ .

أ – لەسەرپلیکانەی بچوك لە هێڵی ناوەڕاستدا هەرچۆن دایان بنێی گونجاوە (بەواتای کلکەکەی بۆسەرەوە یان بۆ خوارەوەبێ)

ب – لە خوارووی هێڵی ناوەراست (هێڵی سێیەم) دەشێ کلکەکەی بۆسەرەوە بێت . دەبێت لەسەرچی پلەیەکی دەنگی دانرا کلکەکەی بگاتە هەشت پلەی دەنگی (ئوکتاڤێك) بەرزتر . وەکو لەم وینەیەدا :



جـ – لەسەروی هێڵی ناوەراستدا بوو دەشێ کلکەکەی بۆخوارەوە بێت . هەروەها لەسەرچی پلەیەکی دەنگی (هێڵ یان بۆشایی) دانرا دەشێ کلکەکەی بگاتە هەشت پلەی دەنگی گرتر (نزم تر) وەکو لەم وینەیەدا :



## ● درێژکردنەوەی بەهای کاتەکانی مۆسیقا .

## (اطالة القيم الزمنية للنوطات الموسيقية)

هەندێ نیشانە یان هێمای مۆسیقای هەیە لەگەڵ کاتەکانی مۆسیقای‌دا بەکاردێت بۆدرێژ کردنەوەی بەهای کاتە مۆسیقای‌یەکان .

ئەوانەش ئەمانەن :-

١ – پنت (النقطة) (٠)

بریتی‌یە لە پنتێك (خاڵێك) لەپاش کاتەکانی مۆسیقاوە دائەنرێ تابەهای کاتەکە نیوەی خۆی زیاتربێت وەکو :

رۆندی پنتدار

نواری پنتدار

٢ – دوو پنت (النقطتان) ( . . ) :

ئەتوانرێ دوو پنت لەدوای کاتە مۆسیقانەوە دابنرێ بو زیادکردنی بەهاکەیان . وەکو وتمان پنتی یەکەم نیوەی بەهای کاتەکە زیادئەکا دووبارە پیتی دووەمیش نیوەی بەهای پنتی یەکەم زیاد ئەکات بەواتای هەردوو پنتەکە ($\frac{3}{4}$)سێ چارەکی کاتە سەرەکیەکە زیاد ئەکەن وەکو

روندی دوو پنت

٣ – بەستنەوە (دەسترازە) (یەك خستن) الرباط

بریتی‌یە لە بەستنەوەی دەنگەکانی مۆسیقاو یەك‌خستنیان بەهۆی هێمایەکەوە لەم شێوەیەدا ( ⌒ ) . جا دوو

جۆریشی بەستنەوەهەیە .

أ – بەستنەوەی ساتی (دەسترازەی کاتی) الربط الزمنی
(Slur)

بەستنەوەی چەندکاتێکی مۆسیقایی بەیەکەوە بۆ ئەوەی بەیەك ژەم لیٚبدرێن بەمەرجیٚ ئەوکاتە مۆسیقایی یانە لەیەك پلەی بڵندی دابن . بەواتای یەك دەنگ بن وەکو :–

ب – بەستنەوەی ئاواز (دەسترازەی ئاوازی) الرباط اللحنی
(Legatto)

بریتی یە لە بەستنەوەی چەند دەنگێکی مۆسیقایی ی جیاواز لە پلەی بلندیو نزمی دا بۆ ئەوەی لە لیٚداندا بەیەك ژەم لیٚ بدرێن .

**تیبنی :–**

نابیٚ ئەوەمان لەبیرچیٚ ئەو جۆرە بەستنەوەیەی لەم بابەتەدا مەبەستمانە جۆری یەکەمەو ، جۆری دووەم بۆ تەنها ژەنینی یەك ژەمی یە .

٤ – کرونا (تاج) فیرماتا (Fermata)–

بریتی یە لە هێمایەك کە لە شێوەی• پیتی نونی هەڵگەڕاوە دایەو ، شێوەکەشی لە تاج ئەچیٚ بویە پیٚ ی ئەڵێن کرۆنا ، بەکاریش ئەهێنریٚ بۆ زیاد کردنی بەهای دەنگێکی (کاتیکی) مۆسیقایی بە گوێرەی بیرکردنەوەی ئامێر ژەنەکە ، یان ڕەهبەری تیپە مۆسیقای یەکە .

● نیشانەی پشوودان – Rests–

علامات السکوت – Pausa –

چەند هێمایەکە لەسەر پلیکانەی مۆسیقا بەکارئەهێنریٚ ، وەکو :

کاتەکانی مۆسیقا بەلاٚم ئەمان بۆ دیاریکردنی کاتی پشوودانە لەو پارچە ئاوازەدا .

واتە هەر کاتێکی مۆسیقای بەرامبەری پشوویەکی تایبەتی خۆی هەیەو کاتی پشوودانەکەی بەئەندازەی کاتە مۆسیقایی یەکەیەتی وەکو لەم خشتەیەدا .

| کاتە موسیقای یەکە | هێماکەی (پشوودان) | ژمارەی پشوودان |
|---|---|---|
| روند |  | پشووی کاتی تەواو<br>٤ ژمارە وەستان |
| بلانش |  | پشووی نیوکات<br>٢ ژمارە وەستان |
| نوار |  | پشووی چارەك<br>١ ژمارە پشوو |
| کروش |  | ١/٨ پشوی کاتی تەواو<br>١/٢ ژمارە پشوو |
| دبل کروش |  | ١/١٦ پشووی کاتی تەواو<br>١/٤ ژمارە پشوو |
| تربل کروش |  | ١/٣٢ پشووی کاتی تەواو<br>١/٨ ژمارە پشوو |
| کواتربل کروش |  | ١/٦٤ پشووی کاتی تەواو<br>١/١٦ ژمارە پشوو |

**تیبنی :–**

لەبەشی پێشوودا باسی درێژکردنەوەی بەهای کاتە مۆسیقایەکانمان کرد . هەربەو جۆرەش ئەتوانریٚ بەهای کاتی پشوودانەکان زیادبکەین .

سەرچاوەکان :–


١ – نظریة الموسیقی (ادلف وانهاوزر)
٢ – نظریة الموسیقی حسین قدوري
٣ – منهج مادة النظریات الموسیقی العام (معهد الفنون الجمیلة في السلیمانیة) اعداد صلاح رؤوف
٥ – قاموس هارڤرت الموسیقیة :
Harvard Dictionary of music by willi apel
٦ – طرق تعلیم الموسیقی (عائشة صبری)
٧ – نظریة الموسیقی (روح الله خالق)
٨ – مبادئ الموسیقی النظریة : ف – أ – فاخاردمیف
ترجمة رؤوف موسی الکاظمی

# منداڵ بۆچی پرسیار دەکات ؟

جەلال ژاڵەیی

منداڵ هەر لە سەرەتای ژیانیەوە ، بۆ پشکنین و تاقیکردنەوەی جیهانی دەوروبەری ئارەزوویەکی زۆر دەردەبڕێت ، لەبەر ئەوە ، دەبینین ! دەگەڕێت و ، شت دەپشکنێت و یاری یەکانی خۆی دەشکێنێت و ، تاقییان دەکاتەوە ، بۆ ئەوە بزانێت ، چی لە نیویاندا هەیەو . چۆن دەجوڵێن ، کە زمانی گرت و ، ووشە فێربوو ، دەبینین پرسیار بەکاردەهێنێت ، بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانی .

ئەگەر مەبەستی پرسیار بەلای گەورەوە ، تاقیکردنەوەو تێ گەیشتن و ، فێربوون بێت ، یانڕاهێنان بێت ، ئەوە بەلای منداڵیشەوە ، هەر ئەومەبەستانەی هەیە .

ئێمە لە کاتێکدا کە باسی منداڵ دەکەین ، باسی پرسیاری ئەو منداڵانە دەکەین ، کە تەمەنیان لە نێوان (٢-٥)ساڵیدایە ، چونکە منداڵ لەم تەمەنەدا ، بەتایبەتی لە نێوەڕاستی ئەم تەمەنەدا ، پرسیاری زۆر دەکات ، لەبەرئەوە دەتوانین ئەم تەمەنە بە قۆناغی پرسیارکردن دابنێین .

باشە ، ئەگەر منداڵەکەت ، پرسیاری لێکردیت و ، ووتی : خوا لەکوێیە ؟ بەهەشت چی یە ؟ بابە تۆو دایە دەمرن یانا ؟ هەتاوو شەوان بۆ کوێ دەچێت ؟ چۆن وەڵامی دەدەیتەوە ؟ ! بەداخەوە دەڵێم زۆر دایك و باوك هەن ، لە پرسیاری منداڵەکانیان وەڕس دەبن و ، وەڵامیان نادەنەوە ، یان سزایان دەدەن ، یان وەڵامەکان دەگلێنن و ، دەیان کەنە ژێر لێوەوە ، یان وەڵامی نادیارو درۆیان دەدەنەوە ، بەم کارەنەیان ستەمێکی زۆر لەمنداڵەکانیان دەکەن ، لە نەزانی و ترس و پەشێوی و سەرسامی و دڵەڕاوکی و پەستیدا ، دەیان هێڵنەوە ، چونکە منداڵ پرسیار ناکات ، ئەگەر هەست بەم پەشێوی یە دەروونیانە نەکات .

**مەبەست لە پرسیارکردنی منداڵ چی یە ؟**

مەرج نیە هەموو کاتێك ، منداڵ هەست بەنەزانی بکات و ، ئەوجا پرسیاربکات ، بەڵکو جاری واهەیە دەیەوێت بەهۆی پرسیارکردنەوە ، پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەکەسانی دیکەوە ، بەهێزو بتەو بکات ، یان دەوربەری خۆی تاقیبکاتەوە ، یان سەرنجی گەورەکانی دەورو پشتی ، بۆلای خۆی ڕابکێشێت ، هێندێجار مەبەستی لە پرسیارەکانی هیچ نیە ، بەڵکو قسەکردن و ڕاهێنانە ، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە ، کە پرسیارەکەی کرد ، چاوەڕێی وەڵامەکەی ناکات ، بەڵکو پرسیارێکی دیکە ئاراستە دەکات ، بەووشە ناوەستێت ، پرسیاری سێیەم ئاراستە دەکات ، بەمە گەورەکەی دەوری ، وەڕس دەکات ، کاتی واهەیە مەبەستی منداڵ لە پرسیارەکانی ، بەرهەڵستی کردنی گەورەیە ، دژدانەوەو بەرهەڵستی کردنە ، بەرامبەر ئەو گەورانەی کە ڕقیان هەڵساندوە ، ئەمیش نارەزایی خۆی بەو پرسیارانە ، دەردەبڕێت ، کاتی واهەیە منداڵ مەبەستی لە پرسیارکردنەکەی ، شکاندن و ، سووك کردنی گەورەیە ، بۆ نموونە دەپرسێت : بۆچی واسەرت ڕووتاوەتەوە ؟ بۆچی واجلەکانت شڕن ؟ بۆچی ئەو چاوەت کوێرە ؟ کاتی واش هەیە ، منداڵ دەترسێت ، بۆیە پرسیار دەکات ، بەتایبەتی کاتێك کە گۆڕانی تازە بەسەر باروجۆری

ژیانیدا هاتبێت ، لە باخچەی ساوایاندا ، یان لەپۆلی یەکەمی سەرەتاییدا وەربگیرێت ، دەبینین لەو گیان لەبەرانەی کە لە ڕێگەی قوتابخانەدا ، تووشی دەبن ، دەترسیت ، با پەلاماریشی نەدەن ، لەبەرئەوە دەپرسێت : بابە مانگا گۆشت دەخوات ؟ یان گازدەگرێت ؟ ڕاستە بزن مندالّ دەخوات ؟ . . گرنگ ئەوەیە ، وەلاّمەکانت دلّنیایی‌یان تێدا هەبێت ، لە سرر تۆلّە دوری‌خاتەوە .

## باشترین وەلاّم

وەلاّمی پرسیاری مندالّ بەپێی تەمەنی دەگۆڕێت ، چەندێك مندالّ تەمەنی کەم‌بێت ، ئەوەندە دەبێت وەلاّمەکانی ...ڕو ئاشکراو ، ئاسانو ، ڕوون بێت ، چەندێك مندالّەکە تەمەنی گەورە بێت ، ئەوەندە دەبێت وەلاّمەکانی درێژو بلاّوو شی‌کردنەوەی ، زیاتر تێدا هەبێت .

– ئەبێ وەلاّمی پرسیاری مندالّەکەت ، ڕاست بێت ، ئەگەر ڕاست نەبێت ، کە دوایی بۆی دەرکەوت ، درۆیە ، ئەویش باوەری پێت نامێنێت .

– ئەبێ کورتو ، تەواو ، زیرەکانە بێت ، ئەگەر درێژو ، درێژ دادربێت ، ئەوکاتە ، توانای نابێت ، گوێت بۆ ڕابگرێتو بیزار دەبێت ، چونکە بیرکردنەوەی مندالّ ، زۆر برناکاتو ، ناتوانێت هەموو وەلاّمێکی پێچاو پێچو ئالّۆسکاو ، هەلّمژێت .

– ئەبێ وەلاّمەکەت قایل‌کاربێت ، ئەگەر وەلاّمی پرسیارەکانی مندالّ ، ئەم مەرجەیان تێدانەبێت ، ئەوکاتە مندالّەکە پەنادەبات ، بۆ هاوڕێکانی ، یان پەنا دەبات ، بۆ کەسانێکی نەزانو ، ناشارەزا ، لەوانەیە نەتوانن وەلاّمێکی ڕاستی بدەنەوە ، ئا بەم چەشنە ، تووشی زیانی دەروونی‌و ڕۆشنبیری دەبێت .

خوێنەری هێژا : هەرچەند هەولّدەیت ، مندالّەکەت ، لە هێندێ باوەری زیان بەخش ، دوورخەیتەوە ، بۆت نالوێت ، بەچەند شێوازێکی زیرەکانە نەبێت ، بۆ نموونە : ئەگەر بتەوێت ، مندالّەکەت ، باوەری بەدێوو ، درنجو ، جنۆکەو ئەوانگەل نەبێت ، ناتوانیت ، یەکسەرنەبوونی ئەمانەی پی‌بسەلمێنیت ، چونکە ئەگەر تۆش فێری نەکەیت ، لە کۆمەلّەوە ، لە قوتابخانەوە ، لەکۆلاّنەوە، لە گوێ‌گرتن ، لەو چیرۆکانەوە ، کە پیروپیرێژن ، بۆی دەگێرنەوەو ، باسی دێوو درنجیان تێدا هەیە ، باسی دێوەرەش‌و ، دێوە سپییان تێدا هەیە ، لە ئەفلام کارتۆنەوە ، فێر دەبێت ،لە بەرئەوە ئەگەر لەبارەی ئەم جۆرەشتانەوە ، پرسیاری لی‌کردیت ، نابێت ، یەکەندەردوو بلّێت ! نین ، چونکە باوەرت پیّ ناکات ، ئەوکەسانەی کە فێریان کردووە ، لە تۆ زۆرترن ، لەبەرئەوە زۆر کەرەت، پرسیاری سەیر ، دەکات ، وەکو : ئەم پرسیارانەی کە وەلاّمەکانیان لەگەلّە :

پ – بابە منتان لە کوێ بوو ؟ کارێکی هەلّەیە ئەگەر بلّێت : تۆمان دۆزیوە ، یان تۆمان لە قەرەج کریوە ، یان تۆمان کریوە ، بەلّکو دەبێت بلّێت ! تۆ لەسکی دایکتەوە هاتویت ، جارێکیان مندالّێك لێی‌پرسیم ! پێش ئەوەی لە سکی دایکمابم لە کوێ بووم ، ووتم لە پشتی باوکتا بویت .

پ – خوا لە کوێ‌یە ؟ . وەلاّم : خوا لە ئاسمانە .

پ – بۆ لە ئاسمانە ؟ چونکە بەرزە چاوی لە هەموو کەسێکەوەیە .

پ – بابە نەژاد بۆچی مرد ؟

وەلاّم : چونکە پاك‌و تەمیزی خۆی ڕانەدەگرتو ، نەخۆش کەوت .

پ – بابە مندالّ کە مرد ، بۆکوێ دەچێت ؟

وەلاّم : دەچێت بۆ بەهەشت

پ – بەهەشت چی‌یە ؟

وەلاّم : شوێنیکی زۆر خۆشە .

پ – بابە ڕاستە مندالّ کە مرد ، لە قەبرەکەدا ، دەی‌سووتێنن ؟

وەلاّم : نەخەیر ، درۆیە ، خوامندالّی خۆش‌دەوێتو ،



نای‌سوتێنێت

پ – بابە جنۆکە چی‌یە ؟

وەڵام : جنۆکە گیانلەبەرێکی ئەوەندە ووردە ، بەچاو نابینرێت .

پ – بابە راستە نەنکی (خەجە)ی هاورێم ، شەوەیەکی گرتووە ؟

وەڵام : نەخەیر خەجە درۆ ناکات ، بیستویەتی ، بەڵام نەنکی درۆ دەکات ، چونکە شەوە درۆیە نییە .

پ – بابە راستە دێو زۆر گەورەیە .

وەڵام : نەء ، زۆر بچوکەو ، بەسەزمانە ، زۆر جاردەبێتە ژێر پێوە .

خوێنەری هێژا : تۆکە دەڵێت : جنۆکە زۆر ووردە ، دێو زۆر بچووکە ، مانای وایە ، بێ‌نرخیان دەکەیتو ، لەبەر چاوی سووك دەبن گرنگ ئەوەیە وەڵامەکانت . دڵنیایی‌یان تێدا هەبێت ، لە سزاو تۆڵە دوری‌خاتەوە ، منداڵ خۆی کە گەورەبوو ، باوەری بەرامبەر ئەم جۆرە شتانە دەگۆرێت ، بەپێی ئەورۆشنبیری‌یەی لە دەوروبەرو کەسانی دیکەوە ، وەریان دەگرێت .

## کەڵکەکانی وەلامدانەوەی پرسیاری منداڵ

کەڵکەکانی وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵ ، زۆرن ، بەڵام لێرەدا چەند کەڵکیکیان باس دەکەین :

١ – گرنگترین کەڵکی وەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵ ، پەرەپێدانی گەشەی کەسێتی‌یەتی ، لەسەربنچینەیەکی پتەوو ، پەرەپێدانی باری زمان راهاتنی لەسەر ووشەو رستەکان . هەروەکو چۆن شارەزایی فێردەبێت .

٢ – یەکێکی دیکە لەکەڵکەکانی ، کەفێری گوێ‌گرتن ، لە ووتەو باس‌و ، گوێ‌رایەڵی دەبێت .

٣ – هەست بەدڵنیایی‌و حەسانەوەیەك دەکات ، هەست بەبەشداری باری (وجدان)ی دەکات ، ئەوکاتە بە سوكو ئاسانی بەدەم دەستی کەس‌وکارێوە ، دێت ، لێیان تێ‌دەگاتو ، لێی تێ دەگەن .

## زیانەکانی وەڵامنەدانەوەی پرسیاری منداڵ .

١ – ئەگەر پرسیار منداڵ پشت‌گوێ بخەیتو ، وەڵامی نەدەیتەوە ، واتێ‌دەکات ، پرسیارەکەی لە جێگەی خویدا نیەو ، تەریقی کەرەوەیە ، لەبەرئەوە هەست بەگوناە دەکاتو ، تووشی دڵەراوکێ‌و تەریقی‌و گۆشەگری‌و دورەپەرێزی ، لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌و خیزان دەبێت .

٢ – ئەو لێکۆڵینەوانەی نە لەم بارەیەوە کراوون ، دەریان خستووە ، راکردن لەوەڵامدانەوەی پرسیاری منداڵ ، دەی‌خاتە گیروگرفتێکی بێ‌پەیەوە ، بەبێ ئەوەی بزانێت چۆن خۆی رزگار دەکات .

### گرنگترین سەرچاوەکان


١ – ملاك جرجيس – الدكتور مشاكل الصحة النفسية للاطفال من منشورات الدار العربية للكتاب – طرابلس ليبيا – ١٩٨٥ .

٢ – هيلين روسن – مخاوف الأطفال – ترجمة الدكتور السيد محمد خيرى . اشراف الدكتور عبدالعزيز القوصى – ط ١ القاهرة ١٩٥٥ .

٣ – نورى جعفر – الدكتور – الخيال العلمى في أدب الاطفال ط ١ ١٩٨٥ – بغداد .

٤ – مصادر أخرى .

**دوکتۆر مەریوان حسن حسنی**

# ناڵەباری یە دەروونی یەکانی منداڵ

هەموو جۆرە نەخۆشییە دەروونی یەکانی کە لە گەورەدا هەیە بۆی هەیە لە منداڵانیش‌دا ببینرێت ، ئەگەر چی نیشانەکان لەوانەیە جیاوازیان هەبێ .

بەلاّم گرنگترین ناڵەباری‌ی دەروونی لە منداڵدا بریتی‌یە لە گیروگرفتەکانی هەڵس‌و کەوت (التصرف) کە بە زۆری لە کۆمەڵێك (مجموعة) منداڵدا بەیەکەوە دەبینرێ‌و ، دەکرێتە دوو بەشەوە .

١ - ئەو هەڵس‌و کەوتانەی زیان دەبەخشنە کۆمەڵ . (دژە کۆمەلایەتیەکان - anti social) :-

وەك : دزین ، درۆکردن ، دوورکەوتنەوە لە ماڵەوە بەبێ هۆ ، بەرەڵلایی ، خوگرتن (الادمان) بە دەرمان وە یان بە ئەلکهول (ئەمە بەزۆری لە کۆمەڵگا تێك‌شێواوەکانی رۆژئاوا دەبینرێ)وە هەروەها هەموو زیان بەخشین‌و تاوانێك بە کۆمەڵ (المجتمع) .

٢ - ئەو هەڵس‌و کەوتانەی زیان نابەخشنە کۆمەڵ (واتە دژە کۆمەلاّیەتی نین) وەك :-

أ - گیروگرفتەکانی خوو رەوشت : بۆ نموونە : پەنجە مژین ، نینۆك گەستن ، میز کردنی شەوانە ، خۆڵ خواردن . زمان گرتن (تلعثم) .

ب - ناڵە باریەکانی کەسایەتی : بۆ نموونە : شەرم کردن ، خەو خەیاڵ کردن ، توورەو توندی ، دڵناسکی . کەللەرەقی‌و ، نەحەجان .

جـ - گیروگرفتەکانی قوتابخانە : وەك : نەچونە قوتابخانەو یا خۆ دزینەوە لە قوتابخانە وەیانیش دواکەوتن لە وانەکان .

د - نیشانە دەروونی‌یە جەستەییەکان :

ناڵەباری دەروونی منداڵ لەوانەیە کاربکاتە سەر دەمارەکان‌و نیشانەی جەستەیی تێدا بەدیارکەوێ .

وەك : نەخواردن ، رشانەوە ، سك‌چوون‌و قەبزی .

**هۆیەکانی گیروگرفتی هەڵس‌وکەوت لە منداڵاندا :-**

هەرچەندە هۆیەکان بە تەواوی دەست نیشان نەکراوە ،



بەلام ئەم خالانەی خوارەوە گرنگییان هەیە :

(١) - بۆماوەو رەچەلەك .

(٢) - بوونی نەخۆشی وە یان کەمو کورەیەکی جەستەیی .

(٣) - زیرەکی : نازیرەکی وەیان زۆر زیرەکی (ئەو منالانەی کە گیروگرفتی هەلسو کەوتیان هەیە یا نازیرەکن وە یەنیش ئێجگار • زۆر زیرەکن ، واتە زیرەکی ئاسایی گرنگیی نیە .)

(٤) - پەیوەندی خراپو گیروگرفتی دایكو باوكو هەروەها سوور بوونیان لەسەر هەندێ شت لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بۆ نموونە : دەرکردنیان ، بەراوردکردنیان لەگەل منالانیتر ، زۆر ئاگاداریو زۆر خۆشویستنیان (مەبەست لێرەدا ئاگاداریو خۆشەویستی لە رادە بەدەرە بەجۆرێك کە نەتوانن هیچ شتێکیان لێ قەدەغەکەن هەرچەند ئەو شتە زیان بەخشیشی بێت) .

(٥) - هۆی کۆمەلایەتیو گەشەکردن :

وەك چۆنیەتی گەورەکردنی مندالو ژیانی خێزانو دانانی منال لە دایەنگا (الحضانە)و هەروەها خوو نەریتی کۆمەل .

(٦) - ئەو دەورو پشتەی کە منال تیایدا دەژی : وەك ژیان لە شوێنی زۆر قەلەبالغو یا شوێنی زۆرپیس ، هتد . .

**چارەسەرکردن :**

چارەسەری نالەبارییە دەروونییەکانی مندال دوو لایەن دەگرێتەوە .

(١) - چارەسەری منداڵەکە :

باشترین جێگا بۆ چارەسەری ئەو جۆرە مندالانە شوێنی تایبەتییە بۆ راوێژکردنی مندال کە تیایدا کۆمەلە کەسێك ئیش بکات پێکهاتبێ لە پزیشکێکی دەروونیو کەسێکی پسپۆر لە دەروونزانیو لێکۆلەرەوەیەکی کۆمەلایەتی کە بە جۆرێك لە هەر منداڵێك بکۆلنەوەو بتوانن دەست نیشانی ئەو هۆیانە بکەن کە کاریان کردۆتە سەر مندالەکە ، ئینجا چارەسازی دەروونی منداڵەکە بکەن هەر منداڵەکەی بەتەنیا وەیان باشتر وایە کۆمەلێك بەیەکەوە بەهۆی دانیشتن لەگەلیان دووجار لە هەفتەیەکدا بۆ ماوەی «٤-٦» مانگ . هەروەها هەرکاتەی ئەو مندالانە پێویستیان بە دەرمان بوو بیان درێتی وەك دەرمانە هێمن کەرەوەکان (المهدئات - tranquillizers بۆ مندالە تووڕەو توندەکان ، وەیان دەرمانی دژەخەمۆکی (ضد الكابة - anti depressant) بۆ ئەو مندالانەی تووشی میزی شەوانە (التبول الليلي) هاتوون .

لە هەندێ حالەتیشدا کە مندال هەلسو کەوتەکانی دژە کۆمەلایەتی بێت وە یا ئەو دەوروبەرەی تێیدا دەژی نالەبار بێت جیا کردنەوەی لە شوێنو دانیشگەی تایبەتی بۆ ماوەیەك پێویستە .

(٢) - چارەسەری باوانی منداڵەکە :

چارەسەرکردن باوان بە یەکسانیو تەنانەت زۆر جاریش زیاتر لە چارەسەری منداڵەکە گرنگترە . چارەسەری باوانیش بریتییە لە یارمەتیدانیانو راوێژکردنیان بۆ تێگەیشتن لە گیروگرفتی منداڵەکانیانو پەیوەندی باشو پتەو بەستن لە گەلیاندا .

**سەرچاوە :**

A Hand book of Medicine For Practioner (Thirteenth Edition) April 1985

--محمود زامدار--

# « هەتاوی کورد »

# و

# سەردەمی راپەڕین

گۆڤاری (هەتاوی‌کورد) قەفێکی ئەستوورو یەکێکە لەو گۆڤارانەی کەبەر لەجەنگی یەکەمی جیهانیو دوای جاردانی (مەشروتیەت) لە شاری ئەستەمولّو لە «تشرینی یەکەمی . .»[1] سالّی «١٣٢٩» رۆمی ولەلایەن کەلّەرۆژنامەنوسی نەمرو نەتەوەپەرستی کورد (عبدالعزیز بابان)و شان بەشانی دەستەیەکی رۆشنبیرو شاعیرو لێهاتووانی کوردی کوردستان تورکیا دەرچووەو لەچاپخانەی (حیکمەت)یش بەقەوارەی (٢٤×١٩ سم)و بەهەردوو شێوەزاری کوردیو چەند لاپەڕەیەکیش بەتورکی بەچاپ گەیشتوە . .

ئەم گۆڤارە سەرامەدە لەو سانە سامناکو تەنگەبەرەدا سەری‌هەلّداوە کەبزووتنەوەی سەرفرازی (کوردایەتی) گەیشتۆتە ئەوپەری هەلّچوونو جۆشو خرۆشەوەو . جۆرەها دەستەی سیاسی هاتۆتە دامەزراندنو جاری سەربەستیو رزگاربوونیان داوەو خەلّکیان لەخەوی غەفلەت بیدار کردۆتەوەو تینوتاویان داوەتە خوێنی مەییوی لاوانی کلۆلی کوردەوە . . . !

ئەو دانە هەرە دانسقەو دەگمەنەی کەوتە دەستم (٥ر٦) شەش لاپەڕەو نیوی لیّ‌بوەتەوەو ئەوەی لەلاپەرە (٧–٨)یش دایە . بیّ‌سەروبەرەو چ مانایەکی ئەوتۆ نابەخشیّ . تەنیا ناوی دوو نووسەری هەردوو وتارەکە (ج . م . ح) و (زەهاوی زادە)ی لەسەرە . . ! وەك بۆم ساغ بوەوە ئەم ژمارەیەی لەمەر مندایە ژمارە (٣)و بەرواری کانوونی یەکەمی سالّی (١٣٢٩)ی لەگەلّ خۆیا تۆمار کردوە . . ! جانازانم ئەو گۆڤارە حەفتەیی بووە یا مانگانە یا دووحەفتانە . یا تەنیا هەرتەنیاو بەس ئەو (٣) ژمارەیەی لیّ‌دەرچووەو هیچی‌تر . . ! ؟ بەلاّم بەبەراوردێكو بەرابینینێكو دەرەنجامێك وەك لەنێو نامەیەکی تورکی نێو ئەو گۆڤارەیە ، ئەوەشم بۆساغ‌کراو دلّنیابووم کە (مانگانە) بووە . . کەلەپاشا بەوردی باسی لێوە ئەکەین .

ئەمەیانوا . . لەلاپەڕەی (٩)ی ئەو گۆڤارەدا نامەیەکی پڕسۆزی (تورکی)و بەهەستو هەواوژانێکی قوولّی (کوردایەتی)بەوە لەلایەن قوتابیانی (مدرسة الزهراء الرشادیە)ی شاری (وان)ی کوردستانو بەناوی ئەوانەوە (عبدالمجید) ناوێك

نێردراوەو تێیدا گەلێ ئامۆژگاریو راووسەرنجی رۆشنبیرانە هاتووەو لەئەنجامیشا پیرۆزباییەکی گەرمیان لەدەرچوونی (هەتاویکورد) کردووەو ئەڵێن :

«جێی داخو خەفەتە کە رێنمایی‌و ئامۆژگاری موسڵمانان . ئامۆژگاریی دینی‌و دنیایی پشت‌گوێ‌بخرێ‌و باروچۆنیەتی ئەو شتانە کە خەڵك بەرەو کلکەلەقیو دووبەرەکیو لێك‌دابرانیان دەبەن ، جگە لەگوڵەزو پێکەنینێکی خەماوی دوژمنانە نەبێ ، بەچ‌کارێکی دی بەسەرنابەن :

(سریع الی ابن العم یلطم وجهه ولیس الی راعی الندی بسریع) .

بەڵێ : کە تواناو دەستمان بەسەر دوژمنا نەشکێ ، ئەوا ئەو توانایە بەسەر یەکتریماندا خەرج‌ئەکەین . . ! لەزەمانێکی سەیرداین‌و دەژین ، کە سەیری هەرکەس‌و هەر (مورشید)و هەر (موجتەهید)و هەر (سیاسی)یەك دەکەیت ، خۆی بە پیاوی چاك‌و رەندو مەردو ئەوانەی تر بە بەدکارو خراپ دێتەبەرچاو . . گەر ئەم بارە وابێ کار چۆن پێك‌دێ . . ؟

میللەتانی‌دی کەوازیان لەقسەی پروپووچ‌و رووت هێناوەو روویان کردۆتە (کار) تادێن بەرەو ترۆپکی بەرزیو بەختەوەری سەردەکەون . . . !

بەڵێ : ئەوەی میللەت وریا ئەکاتەوە ، پێویستە خۆی وریاو بەئاگابێت ، تا دوبەرەکیو لێك‌ترازان‌و ململانێ روونەدات . . !

ئەی دەستەی بەڕێوەبەری بەرێزی هەتاوی کورد :

ئێمە ، سەراپای کوردان شوێن‌پێی رێرەوی بەرزی ئێوە هەڵئەگرین‌و سوپاستان ئەکەین . . . . خوای مەزن دەست بە باڵتانەوە بگرێ . . ،»

«لە شاگردانی قوتابخانەی زەهرای رەشادیەی وان : (عبدالمجید)»

دوابەدوای نامەکە ، گۆڤارەکە لەپەراوێزا وریای کردونەتەوە کە لە ژمارەی (داهاتوودا . . ! ؟) وەڵامی ئەوان

(بوکورەکان کرد)

دنیا که مقامیکه دبی روله‌فانی   ساوکـەزور مردەکه مشغول سخابی
درحق بەنی آدم واعدای ولاتی   ولك‌حاتم ووك رستم ووك برق‌سمابی
ای‌صاحب جاه وکرم‌سند وتمکین   شکرانۀ ام نعمته چاوشاله کدابی
املاکه بـه ، قدرەبـه ، حرمة بسته   بانوبت جاب نظرخاق خدابی
کوتونیه اژیربار بلای جهل‌وعطالت   باهمت ایوه سبب دفع‌بلابی
ملت‌همویی‌جوتوبەبی قوتورشوروت   ماکینۀبوبینه هتاکلی‌روا بی
سخته همویان سختن بی‌نان کتابن   باب‌نەبـ دس ایوەك بی
باقی نیەام حشمة بوتوله جهاندا   هرجاکه واحسانه کواشهرتی‌چابی
محتاج دسی ایوەیه ام‌قومه فقیره   چاوتان لەدوابی لەوفابی لەصفا بی
خیرتکه لەبوملت دولت نیه غافل   نفی چیه استون دوارت لەسابی
وقت سزوغیرته اتداله کمیندان   امروکه هواصافه دوچاوت لەدوابی

سلیمانیەلی
ژیور



قصیدۀ رحمتی حاجی‌عبدالقادر کوبی

ادبا : چاکه لیم نەبن درهم   لەقصه ولم حکایتی دیکم
ادعای هرضایعیکی بکن   تاکه نەی‌سین امتحانی نکن
بی‌دلین حیله بازو کذابه   شیخ‌بی خارجه لەام بابه
خانقاو تکیه شیخیان یکسر   بیم‌باین نفعیان چەبواخر
غیرتعایم تنبلی کردن   جمع‌املاك وخزنه دا کردن
دفعه‌یك امتحانیان ناکن   نی دبکن‌زهره یانەتریاکن

لەلایەن نجم‌الدین ئەفەندی کەرکوکی‌یەوە ئەدرێتەوە(٢) . . .

* * *

لەلاپەرە (١٠-١١)شدا بەناوی (بووژانەوەی‌کوردان) هەمدیس وتارێك بە (تورکی)و بە بیرێکی فراوان‌و پێشکەوتنخوازی ئەو دەورو زەمانەو بە بۆنەی دەرچوونی گۆڤاری (بانگی کورد) لەبەغدا نووسراوەتەوەو تێیدا باسی ژیانەوەی کوردو راچەنینی گیانی نەتەوایی کورد ئەکات‌و لە برگەیەکیا ئەڵێ :

«لە پایتەختدا کۆمەڵەیەك بۆ خوێندکاران . لە شاری (وان)دا قوتابخانەیەکی تازە بابەت‌لە (بەغدا)(بانگی کورد) دواتریش هەر لە (وان)دا ، دەسکردن بە دامەزراندنی رۆژنامەو چاپخانەیەك(٣) . . . هەموو ئەم دەزگا کوردییانەش بۆ پەرەپێدانی مێژووو بۆ سەرەتایەکی نوێی ئەو مێژووە . . ! ئێمە کە ئەمانە باس دەکەین ، لەپاڵیا لەوپەڕی بەختەوەری داین‌و دڵمان شاد ، چونکە هیواو سوور بونەوەیەکی ترمان پێ

اشعار مرحوم نالی

دل سیاسنك نبی ، مائل خاك وطنه　　خال لعلی حبشی ، ساكن بردیمنه
برچم سنبلی وقد قضیب البانی ...　　زلف بهلولی وخط زنكی ووجه حسنه
عات مظهر جان آیت اعجاز بیان　　لب روح ودهن سر كلام عانه
روشنی دیدهٔ آن سانه كه مژدهٔ قدمی　　روشن دیدهٔ عمدیدهٔ بیت الحزنه
دیت لخوینم مده آلوده مكه دامن پاك　　خوین من ثابته باطل نیه وك رنك خنه
وه كو گل انثی ، غمایوه به برك چمن　　قامتی ناربره ، ناردره ، نارونه
دل نالی كه انیس قرهداغه ، ایستاش
داغ سرچاوه و دیوانهٔ دارودونه
دیسان ای ویه

سرمایهٔ سوداكه دلین ذلف دوتایه　　هر پیچش وتابیكی صدآشوب تیدایه
بیده بدلم . شیفته بوشیفته چاكه ..　　بیخه ملم ، امقیده بدیوانه روایه
اوخالدره ، مسكن صدساله شاید　　جاری لهدم توبه بیم: سك بوفایه ...
ذلفت سیه دل بعذارت كه دسرلی　　سوچ شوه واقاتل پروانه چرایه
نالی كه وقاری نیه : بی باكه لهخلكی
صوفی كه بینكین هیه عجب ورایه
دیسان ای ویه

ذلفت قهدت دا ، كه پریشان وبلاوه　　بوچی لمن شیفته آلوز وبداوه
بوچی نكریم ، صدكرتم دل دشكین　　می . بوزیزی شیشه لصدجیكه شكاوه
هرچندكه روتم بخداماتال رو تم　　بی بركه علت كه هتیو میل هتاوه
هرچوكه وچیكی كهواسور وسوربی　　چی جوشش كریان منه خوینه رژاوه
سوز دله باعث ناوكل كریان　　معلومه كه اكر سبب جوشش آوه
وبی فائده یه منع من ایستا كه له كریان　　بوعاشق بیچاره دوام آوه رژا .

دەبەخشێت ، هیوایەکی پڕ لە هێزو هەرەنگمان بۆ دەرەخسێنێ . . ! هۆیەکی تریش هەیە کە دڵمان پڕدەکا لە شانازی‌و متمانە بەخۆکردن ، ئەویش ئەو وریابوونەوەو ڕاپەڕینە بەجەرگەیە کە لەنێو میللەتانی موسڵمان سەری هەڵداوە . . بۆ یەکەمجار لەنێو ئەو گەلانەی دەرەوەی عوسمانلی‌دا ڕوودەدات ، لەوێوەش بۆ بەشە عوسمانلییەکانی تر پێ‌هەڵدەگرێ‌و بەرەو ناوچە موسڵمانەکاندا تەشەنە ئەکات ، وەکو ئەوەی لەنێو براتورك‌و عەرەبەکانماندا دیارە . . . !

لەپاڵ ئەمەشدا ، بەوپەڕی سوپاسگۆیی‌و سەرفرازی‌یەوە دەڵێین :

کە ئەم شوێنەوارەی زمانی عوسمانلییە ، لە کوردەواری‌دا لە (کوردایەتی)یەوە هەڵقوڵاوەو هەڵدەقوڵێ‌و هەر لێرەوەش بەناو کوردەکانی ئێران‌و ڕوسیادا بڵاو دەبێتەوە ، نیازخوازین ئەو ناوچەو هەرێمانە بەهێزی ڕۆشناییەوە ڕووناك بکاتەوەو بیگرێ ، هەر بەمەشەوە عوسمانلیەتی‌و جیهانی کوردەواری سنگی خۆی دەردەپەڕێنێ‌و خۆی پێوە ئەڕانێ‌و لەماوەیەکی کەمدا سەرانسەری ئەم ناوچەیەو سەرکەوتنی تەواوی ڕەوشتی کوردایەتی هەست پێ‌دەکەین ، کە ڕاپەڕینی مەوداو مەیدانێکی گەورەو فراوانمان پێشکەش دەکا . . (ان مع العسر یسرا) وەك لە سەرتاوەش باسمان لێکرد ، دڵی ئێمە پڕ لە ئومێدەو هیوادارین خۆری ڕاپەڕین‌و کامەرانی ئاسۆگەی کورد ڕووناکتر بکاتەوە . . . ئێمە بەدڵێکی پاك‌و ویژدانێکی ڕوونەوە ، ئەم چەند دێڕانەمان نووسی ، تکاونزا دەکەین بە ڕەنگێکی‌تر لێك نەدرێتەوە بڕوا بە دڵسوزیمان بکەن . . .»

* * *

لە لاپەڕەی (١٢-١٣)شدا بە خامەی (أ . ج . ڕەزا . دەرسیملی)و تارێکی‌ئاگرین‌و بە زمانی (تورکی)و لەبارەی کوردایەتی‌و گیان‌و سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتییەوە ، تۆمار کراوەو ئەڵێ :

«برام : ئا ئەو دەمە ، چیا تاریکەکانی کوردستان بە ڕووناکی‌و ڕێچکۆلەکانی بە ڕەنگی زومرووت‌و شارە وێرانەکانی ئاوەدان دەبێتەوە . . . ! ئەمڕۆ لەنێو شارسانێتی سەدەی بیستەمداین ، گەر ئێمەش بە لێهاتوویی کە شایانی ئەم سەدەیە بێت‌و سوود لەم چەرخە وەرنەگرین‌و بە چەکی زانست خۆمان پڕچەك نەکەین کە شیاوی ئەم چەرخەبێت ، دڵنیابن ناگەینە مەنزڵ‌و ڕزگار بوونمان دوور . . . ! جا تێگەیشتی کە چۆن هێزی ماددی‌و زۆری‌ی (کەسانی) میللەتێك ، پاسەوانی حکوومەتی میللەتێکی پێ‌ناکرێ . . بیری فراوان‌و بزۆز ، مێشکی ڕەسیدەو پێگەیشتووی پێویستە .

ئێوە بزانن من چۆن بۆی ئەڕۆم‌و چۆن بیردەکەمەوە . . . لەوانەیە هەندێ پێیان ناخۆش بێت‌و نارەحەت بن ، بەڵام قەیدی چیە باوابێ . . جا گەر دڵێك بە خەون‌و ئەندووی نیشتمانەوە لە لێدان دابێت لەچی دەترسێ ، ئەمڕۆ من ئەمەم لە کوردەکان دەوێ ، حاشاکی نەك هەر من بەڵکو پێداویستی ئەم سەردەم‌و ئەم چەرخە ئەمەی گەرەکە . . . ! با زەنگینەکان کیسەکانیان والا بێت ، ڕووناکبیرەکان خامەکانیان لەدەست

بێت ، نەدارو هەژارەکان هەوڵ بدەنو کار بکەن ، هەوڵو تێکۆشانێکی وا کە هەوارەکان دەوڵەمەندو رووناکبیرەکان زاناو دانشمەند بکات ، لە سەرووی هەموو دادگایەکەوە ، دادگایەکی مەزنو لە زوور گشت دادخوازێکە دادخوازێکی یەزدانیی هەیە ، کە ئەمەش نابێ فەرامۆش بکرێت . . . !

براکانم ، بروانن (دەرسیم) کە زاینگەو زێدمە ، لە بیرو زیرەکیو ئازایی‌و جوامێریدا بێ هاوتایە ، کەوابێ برایانی تریش ، کە هاو رەچەڵەکەنیان ئەو رەوشتە بەرزانەیان هەیە ، کەچی چار چییە ، تا ئێستا وەکوو عەرزم کردن کوردستانیان پێ رزگار نەکراوە . . چونکە کوردایەتی لەنێو نەزانی‌و دواکەوتن دایە . . با هەمدیس دەرسیم بگرینەوە ، چەندین جار ئەم دەرسیمە بۆتە شانۆی مەرگەسات‌و هەروا شانازی‌و سەربەرزیی ، ئەمانەم بەبیردا دێتەوە ، گەربێت‌و لێی وردبینەوە ، ئەو سەربەرزی‌و شانازی‌یە ، تاکێکە لە نموونەو رەوشتە رەسەنەکەی کوردایەتی ، ئەو کارەساتانەش چاڵی ئەو سەرەتایەیە کە کوردایەتی تێیدا نوشوستی هێنا ، ئەمانە چەند راستییەکی تاڵ‌و ناخۆشن ، چەند نموونەیەکی کاریگەرن ، بەلام داخ !

لە رەشووروتی خەڵکەوە تا پیاوە گەورەکانمان ، لە هەژارمانەوە تا زەنگینەکانمان ، سەرتاپایان لەنێو خەوێکی قووڵ‌و بێ‌ئامان دان ، خەوێکی وا کە ئەنجامەکەی مەرگ‌و مردنە . . . ! دەسا برام من وەهای بۆچووم ، خوێشم بەم چەشنە بیروڕایانە بەراست دەزانم . . . من کوردێکی بێ‌دەسەلاتم ، بێگومانیشم کە کەسانی تر هەن لە ئێمە چاکتر بیری لێ‌بکەنەوەو رووناکبیری لە ئێمە سەرپەرترو لە ئێمەش زیرەکتر هەیە . . ! بەلام مەبەستی من سەرکەوتنی ئێوەیەو رێ خۆشکردنێکە بۆ ئەوانەی ئەیانەوێ بیرێکی ورد لەم سووچە بکەنەوەو بەگورجی‌ی هەوڵێك بدەن . . .

ئازیزەکەم : با ئەم نووسینەم کورت بکەمەوەو بڵێم : بە نیازێکی پاکەوە هەوڵدان ، هەروا پێشاندانی مێرخاسی‌و

کردلکده سیالهٔ حیات

بغدادده بانك کردك انتشاری مناسبتیله

اعصار مدیدەدنبری غبار جهالت آلتنده ازلمکده بولنان کردلکك سمای ملول ومحزوننده بوکون دیکر ـ اقوام اسلامیه‌ده رونمون اولدیغی کبی ـ ترارهٔ حیات پارلامغه باشلایور ، شراین واوردەسنده نبی بر حرارت حس ایدیلیور ، وجهنده کنجلکك و عز بتدم ، مرشیه موفق اولەجغم ، اعتقادینی اکدبرر آثار سرورو تبسم کوزوکیور . کوزلرندەجلادت ومتانت پارلدیبور . الحاصل کردلکك هیچ اولمزسه نومدن یقظه‌یه بکسیجون بتون آواز وفغانلر نمودار اولیور . ایشته علائم ومقتطفات !

مرکزده برطلبه جمیتی ، وانده طرزجدید اوزره برمدرسه ، بغدادده بربانك کرد . . دها صکره نه وانده برغزته ومطبعه تاسیسنه تشبث بتون بومؤسسات کرد تاریخ ترقیسنك راسمهٔ افتاحیدر ، دها احجی رأس تاریخ اولملیدر . بونلری ذکر ایدرکن قلبلرمز مشحون سرور اولمقله برابر امید وعزمز فضله برقوت ، قوتمزده فضله برامید حاصل اولیور .

قلبلرمزی فخر و مباهاتله طولدیره‌جك دها بشقه برسبب‌ده وار اوده اقوام اسلامیه‌ده حاصل اولان انتباه وتیقظ اولا عثمانلیلقدن خارج اولان اقسام ومناطقده حصولبولور ، اورادن عثمانلی اقسام ومناطق اسلامیه‌سنه جریان ایدر : ترك وعرب قرداشلرمزده اولدیغی کبی .

بونکله برابر کمال محظوظیت وممنونیتله‌ده سویلرز که کردلکده‌کی بوآثار حیات عثمانلی کردلکندن نبعان ایتدی وایده‌جك ، وبورادن ایران وروسیه کردلرینه جریان ایده‌جك . وامید ایدرز که اورالرینی قوت نوریله فیضاب ایدر . بونکله عثمانلیلق وکردلك عالملری کوکسلرینی قاردەرق افتخار ایتملیدر .

بوسیالهٔ حیاتك عاملرینه کلنجه‌شبهه یوقدرکه کنجلك عزم وهمتی طاشیان ، کنجلك روحی کندینه روح طاقنان ، کنجلك اعتقادیله معتقد اولان کنله‌در . بوکتلهٔ شبابدرکه کمال سکون وآسوده‌کیله کوشه‌لرده سونوك ضیالر آلتنده شدت جهد وجدیت‌سینه دوام ایدوب اوزاتدیغی الیرك ردایدلدیکنه برواایتمه‌رك ، قوروما بوسینی کتیرمیه‌رك بالاده عرض ایتدیکمز تشبثاتده موفق اولدی واولمقده‌در . بوموفقیات نتیجه‌سنده مغرور ومست اولمق خاطرینه بیله کترمدی وکترماز استطراد قیلندن عرض ایدرز که اعاظممز جانلری ایسترسه ، ایستدکلری قدر راحت دوشکنده کنجلکك بوشام اسمیندن بوزچویرسونلر ، باردیـ

بەرگەگرتن رابەری ویژدانتە . . . تاد . . ئەمانە ئەبنە مایەی سەرخستنی کوردایەتی‌و هەر ئەمانەش کوردستان ئاوەدان دەکەن . . . ئیتر ریزم بۆت هەیە براکەم . . . ! ! !

«ـ أ . ج . رەزا . دەرسیمی ـ»

لە لاپەرە (١٤ـ١٥)شدا ، بە سەرناوی (لەخەو هەستن)و بە ناوی (م . ن . دیاربەکری)یەوە وتارێکی یەجگار شیرین‌و بەتام‌و کام و قووڵ‌و بەرفراوان‌و بە (تورکی) هاتووە . کە بە شێوازێکی زۆر جوان‌و سەرپەری (پەخشانی هونەری تورکی) نووسراوەتەوەو داوا لە گەلی (کورد) ئەکات‌و بە زریکەو زایەڵەیەکی خەمگینەوە رووبەرووی ئەبێتە ، تا لەو خەونە بیداربێتەوەو رووبکاتە رێی رزگاری‌و مافی رەوای خۆی ، وەك گشت گەلانی راچەنیوی ئەوسای رۆژهەلات‌و لە برگەیەکیا ئەڵێ :

«راپەرە لەخەو بیدار بەرەوە ئەی برای کوردی ستەمدیدەم ، بەئاگا وەرە ، تا ئێمەش ئازادبین ، تا فرمێسکی چاومان بسرینەوە ، تا ئاگری نێو دڵمان دامرکێ‌و بەختیان

چارەسەر بکرێت . . ! ئەبێ قۆناغی سەرکەوتنی ڕۆژهەڵاتیان بە شەمەنەفەری ڕۆژاوایی‌و بە فڕۆکەی ئەوانەوە ببڕم . . . تا»

* * *

بە ناوی پیرۆزبایی کردن‌و دەرچوونی (هەتاوی‌کورد)و بە ناوی قوتابیانی (حقووق)ەوە ، لە لاپەرە (١٥)دا ، هەمدیس نامەیەکی یەکجار بەسۆزو گڕگرتووی کوردانەو بە زمانی (تورکی) ڕەوانەکراوەو ئەڵێ :

ئەو نەتەوە کوردەی‌کە لەبەر ڕەوشتی بەرزو جوامێری‌و ئازایی زگماکەوە مێژوو ڕێزی لێ‌گرتوە ، ئەمڕۆ لەبەر ئەوەی لەمەیدانی نزمی‌و دواکەوتن دایەو حاڵ‌و بارێکی ئەوتۆی پێ بەخشیوە کە شایانی غەم‌و خەفەت خواردنە . . . . تاد

ئەو شوێن‌و ناوچانەی کە کوردنشینە ، ڕێك‌و پێکی‌ی بەرە لاوە ، وەکو سادەترین کۆمەڵێك تەنانەت قوتابخانەیەکیشیان نیە . . . ! بێگومان ئەم نەخۆشی‌یە خراپترین پەتای نەخۆشی‌ی کۆمەڵایەتی‌یەو تا ئێستا بەداخەوە بۆ چارەسازکردن دکتۆرێك چارەیەکی وای بۆ نەدۆزیتەوە . . ئەمڕۆ بەجێ‌هێنانی کاری ئەو دکتۆری‌یە بە ئێوەی لاوی ڕووناکبیر سپێرراوە ، وەکو ئەرکێکی گەورەی ویژدان ، ڕاپەڕاندنی ئەو هەنگاوانەی کە ئێوە دەیهاوێژن ، ناوێکی نەمرتان پێ‌دەبەخشێ بەبۆنەی ئەم ڕێگاگیریەی ئێوەوە پیرۆزباییتان لێ‌ئەکەم‌و تکای ئەوەشتان لێدەکەم کەپێش هەموو شتێ ، بۆ ئەو زمانە کوردییەی کە خزمەتی نەکراوە ، ڕێزمانێکی بۆ ڕێك بخرێت ، ئەمەیان پێداویستیەکی خێراو بەجێ‌یەو بەهیچ جۆرێ نابێ دوا بکەوێت ، ئینجا زانست‌و هونەرو پیشەسازی پێش‌خستن ، ئائەمە دەبێ ئەرکێکی سەرشانتان بێت . . . !

«- م . ع . محمود - خوێندکارێکی حقووق -»

لە لاپەرە (١٦)ش‌و بە بەرواری کانوونی یەکەمی ساڵی ١٣٢٩و لەلایەن سەرژمێری شاری (ئاینتاب)ەوە . حجی حەسەن تەحسین سێوەرەکی ، نامەیەکەی زۆر بایەخداری بە (تورکی) بۆ دەستەی بەڕێوەبەری گۆڤارەکە ناردوەو گەلێ شتی تێدا ڕوون کردۆتەوە ، لەوانەیش : داوای ڕووکردنە زانست‌و پەروەردەکردنی منداڵانی کوردی کردوەو جاری کردنەوەی قوتابخانەی لە سەرانسەری کوردستانا داوەو لە بڕگەیەکیا ئەڵێ :

«لە ژمارە (٢)ی گۆڤاری هەتاوی کوردی ڕۆژی (٢١)ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٣٢٩ دا ، ئەو وتارەی کە بۆ زانایانی کورد نووسراوە لەتەك وتاری مەولانزادە ڕەفعەت بەگ‌دا ، بەوپەڕی ڕێزەوە خوێندمەوە . . . . لەنێو لاوانی کورددا خامەی ڕووناکبیرانە هەیە ، لەتەك ئەمەشدا ئیمڕۆ پێویستی‌ی کوردستان ئەو نوقسانی‌و کەموکوری‌یە بەتەمەنەیە ، کەپێ‌ی دەوترێ : (پاشکەوتن) . . . دەردێکی زۆر کۆنی کوردستان هەیە کەهیچ مرۆڤێك نیە ئەمە نەسەلمێنێ ، ئەویش :

پێویستە کوردەکان زیاتر بایەخ بە زمانەکەیان بدەن . . . لە شارەکانی کوردستان ، لە شاخ‌و چیاکانی کوردستان کۆمەڵانی خەڵك چاوەنواری کردنەوەی قوتابخانەن . . تاد من وەك کوردێك ، تکا لەدەستەی بەڕێوەبەری هەتاوی کورد دەکەم ، ئەم داخوازیەم بۆ بخرێتە بەرچاو . . . !

لە لاپەرە (١٧)شدا (سلێمانیەلی زیوەر)[٤] قەسیدەیەکی بە شێوەزاری سلێمانی‌و بەناوی بۆ (کورەکانی کورد) بلاوکردوتەوەو کە ئەمەی ئێرە دەقی تەواویەتی :

دونیا کە مەقامێکە دەبێ ڕوو لە فەنابێ

سا ئەو کەسە زۆر مەردە کە مەشغوڵی سەخابێ
دەرحەق بەبەنی ئادەم‌و ئەعدایی وولاتی
وەك حاتەم‌و وەك ڕۆستەم‌و وەك بەرقی سەمابێ
ئەی ساحیبی جاهو کەرەم‌و مەسنەدو تەمکین
شوکرانەیی ئەم نیعمەتە ، چاوت لە گەدابێ
ئەملاکە بەسە ، قەدرە بەسە ، حورمەتە بەستە
با ئەوبەتی جەلبی نەزەری خەلقی خودابێ
کەوتوینەتە ژێر باری بەلای جەهل‌و عەتالەت
با هیممەتی ئێوە سەبەبی دەفعی بەلابێ
میللەت هەموو بێ جووت‌و بەبێ قووت‌و ڕەشوڕووت

ماکینەیی بۆ بێنە . هەتا کامی ڕەوابێ
سوختە هەموویان سەختن و بێنان و کیتابن
بابی (نصر) بابە دەسی ئێوە . کرابێ
باقی نیە ئەم حیشمەتە بۆتۆ لە جیهاندا
هەر چاکەو ئیحسانە کەوا شوهرەتی چابێ
موحتاجی دەسی ئێوەیە ئەم قەومە فەقیرە
چاوتان لە دوایی ، لە وەفابێ لەسەفابێ
خێرت کە لەبۆ میللەت و دەوڵەت نیە ، غافیل
نەفعی چیە ئەستوونی دەوارت لە سەمابێ
وەقتی سەرو غیرەتە ، ئەعدا لە کەمین دان
ئەمڕۆ کە هەوا سافە ، دوو چاوت لە دوابێ

* * *

«ئودەبا چاکە لێم نەبن دەرهەم – لەم قسەو لەم حیکایەتەی دەیکەم» قەسیدە ناودارەکەی حاجی قادری کۆیی‌یەو لاپەڕە (١٧–١٩)ی گرتۆتەوەو بە سەرناوی (قەسیدەی ڕەحمەتی حاجی عبدالقادر کۆیی) تۆمار کراوەو بۆ یەکەمجاریش بڵاو بۆتەوە . . جیاوازی قەسیدەکەی ئێرەش لەگەڵ دیوانە پوختکراوو چاپکراوەکانی حاجی‌دا (گیو – شارەزاو میران) واکەوتەوە(٥) :

ئودەبا : چاکە لێم نەبن دەرهەم
لەم قسەو لەم حیکایەتەی دەیکەم
ئیددیعای هەر سەنایەعێکی بکەن
تاکو نەیبینن ئیمتیحانی نەکەن
پێی دەڵێن حیلەبازو کەززابە
شێخ نەبی خاریجە لە ئەم بابە
خانەقاو تەکیەو شێخێان یەکسەر
پێم بڵێن نەفعیان چبوو ئاخر
غەیری تەعلیمی تەنبەڵی کردن
جەمعی ئەملاک و خەزنە داکردن
دەفعەیەك ئیمتحانیان ناکەن
تێبگەن زەهرە یا نەتریاکن
دەمەحەکی بدەن ئەگەر وەکو زەر
تێدەگەن ڕێگرن وەیا ڕەهبەر
شێخ ئەوانەن دەشێخییان لادا
هیچ کەس رزق هیچ کەس نادا
ئەی خەریکی رموزو نازو نیاز
ئەورووپا فەننی گەییوەتە ئیعجاز
قوللەیی ئیڤلی لە ئەفلاکە
عەکسی ئەو گەردشی دەژێر خاکە
یەعنی ژێر ئەرزی دەبن دەریا
«. . . . . . . . .»
کوورەیی ئەم زەمینەیان پێوا
خاتری تۆیێ چوونە جەووی سەما
قسەیێ ئەمڕۆ دەیگرن لەزوبان
ساڵێ تر بۆت دەکەن بەیێ نوقسان
سەدو پەنجا لوغەت زیادە دەکەن
ساڵێ بۆناوی سەنعەت و بۆ فەن
تۆش وەرە فەننێ فێربە چیت داوە
کافرە یەختییە وەیا جاوە
چینی ئاتەش پەرستن ئێستاکەش
گەبری بێدین و هیندووی ڕوورەش
بۆچی فەرموویەتی نەبیی ئەمین
«اطلبوا علم کم ولو بالصین»
لازمە خول بخۆی وەکو بەرداشی
کوللی قەرنێك دەگۆڕی ئەمری مەعاش
هەرچی بێ بەهرەیە لە کەسی کەماڵ
دەبێتە دەروێش و مارگرو حەماڵ
تەنبەڵی کاری حیزو بێخێرە
دەستی مانەدوو لەسەر زگی تێرە
ئەهلی جەنەت نەشوان و گاوانە

جوتیارو سەپانو (خەرمەسانە) ! ؟
لە حەدیسا هەیە حەبیبی خودا
گوتی : الکاسب حبیب الله
موسحەفی خوایە عالیمی بڕسی
بەدوو نانی دەداتو ناترسی
صۆفی وەك تیشنە بوو لە زیكری هەتاو
سەد نوێژی دەدا بە كاسەك ئاو
شیعە وەك تیشنەبوو لە سینە زەدەن
بە دوو قەترە درا حوسێنو حەسەن
فایدەی **گەر** بدایە زیكرو دوعا
دەبووە قاروون گەدایی سەر ڕێگا
بە قسەی موخبیرو موئەریخی كۆن
میللەتی چینە چارسەد ملیۆن
سەربەسەر دەوڵەتی هەموو ژاپۆن
زۆر بە زەحمەت دەگاتە سیی ملیۆن
ئەهلی ژاپۆن بەفەن و سنعەتی چاك
سەیری چۆن چینی گرتو كردیە خاك
ئیتتیحادی بە ئیتتیفاقی ئەنام
سوپەرە بۆ حەوادیسی ئەییام
كوردی ئێمە نەزانو پاشكەوتن
پێكەوە پووشو ئاگرو نەوتن
بێ ئەگەر دەستی یەكتری بگرن
وەك سكەندەر هەموو جیهان دەگرن
خواردنو سەتری عەوەرتو سوكنا
باعیسی ژنە بۆ گەداو پاشا
حاڵەتی وایە چی لەسەر خاكە
غەیری عینا ، كێ لە ئەفلاكە
ئەو هەموو مەدحی بادەوو دولبەر
نووسراوە لە سەد هەزار دەفتەر
وەكو خەمسەی نیزامی بێ گەنجە

كە لەلای خەڵقی كیمیاو گەنجە
سەدیەكی پاشا شیرنو فەرهاد
بە كۆتایی دێ ، مەعاشو موعاد
ئێستە میللەت دەبوونە ساحیب جاه
یا نەهەمەتای «اولیاءالله»
حەیفە بۆ مەردی ساحیبی تەمیز
هێندە باسی مەكانی پیسو میز
كێ دەڵێ كوردەكان بە ئیدارکن
بەسە ئەم نەقسە گوێ لەمن ناكەن
لە قسەی ساغی من خەلەل دەگرن
واهیمەی شێخەكان لەدڵ دەگرن
ئەوی موحتاجی نانو پیوازە
یا هەتیوبازە ، یانە مێبازە
ئەوكەسەی دەوڵەمەندەكی چاكە
بەندەیی . . . . . .ناپاكە
عیشقبازیو هەوای دەروێشی
میللەتی خستە فەقرو بێ ئیشی
هەموو مردووی میان سمتی خرن
بەیتی مەدداحیان بەمەجان دەكرن
بەیتیمن چونكە كەڵكیان دەگرێ
لە غوربەتیو بێكەسی دەمرێ
تا لەژێر باری دیان نەمرن
زەحمەتە قەدری بەیتی من بگرن
یانە وەك ئەهلی مەغریب ئێستاكی
چیە ناوت ؟ دەڵێ : خریستاكی
باوكم (ئەحمەدە) بە فیكرم دێ
خەڵقی لادێبوو ، دایكم (فاتێ)
ڕۆژی ئەووەل لەبەندەوو ئازاد
خزمەتی خەڵقە قیسمەتی ئەكراد
(حاجی) سابەسیە سەد هەزار دەفعە

پێم گوتی : ئەم قسانە بێ نەفعە
لێی گەڕێ قەومی تۆ هەموو مارن
دزو حیزو پیاو کوژو هارن
مری ناوداری ورچی ناوداره
راستیان خواره ، خواری خونخواره
باوکە هەر چۆنی تۆ دەڵێی وایە
تێدەگەم ئەم قسانە خۆڕایە
قوڕی کام جێ بکەم بەسەر خۆما
ئەمە لێم بوویتە عیللەتی سەودا
بە قسەی چاکە دەستیان دەگرم
تەرکی ناکەم بەلۆمە تا دەمرم

لەلاپەره ٢٠–٢١)شدا بۆ یەکەمجار (٣) پارچە شیعری سەرامەدی شاعیرانی مەزنی کلاسیك (نالی) زیندوو هاتۆتە بڵاوکردنو بە بەراوردیش لەگەڵ دیوانە چاپکراوەکان بەمجۆره کەوتەوه[٦] .

١

دڵ سیاسەنگ نەبێ ، مائیلی خاکی وەتەنە
خاڵی لەعلی (حەبەشی) ساکینی بوردی یەمەنە
پەرچەمی سونبولیو قەددی (قضیب البان)ی
زوڵف بە هلولیو خەت زەنگییو وەجهی حەسەنە
(عیلەتی مەزهەری جان) ئایەتی ئیعجازی بەیان
(لەبی روح) و دەهەنی سیڕرو کەلامی عەلەنە
(رەوشەنی دیدە بە ئینسانە کە موژدەی قەدەمی)
ڕۆشنی دیدەیی غەمدەیی (بیت الحزن) ـە
دەست لە خوێنم مەدە ئاڵوودە مەکە دامەنی پاك
خوێنیمن سابیتە باتیل نیە وەك رەنگی خەنە
وەکو گوڵ ئاتەشی (غەملێوه) بەبەرگی چەمەنی
قامەتی نارەبەره ، ناردەره ، نارەوەنە
دڵی (نالی) کە ئەنیسی قەرەداغە (ئێستاش)
داغی سەرچاوەوو دێوانەیی دارو دەوەنە

٢

سەرمایەیی سەودا کە دەڵێن زوڵفی دووتایە
هەر پێچش و (تابێکی) سەر ئاشوویی (تێدایە)
بیدە بە دڵم ، شیفتە بۆ شیفتە چاکە
بیخە ملم (ئەم) قەیدە بە دێوانە رەوایە
ئەو خاکی دەره مەسکەنی سەر ساڵەمە شایەر
جارێ لەدەمی تۆ ببیەم سەگ بە وەفایە
زوڵفت سەبەبە ، دڵ بەعوزارت کە دەسووتێ
سووچی شەوه (وا) قاتیلی پەروانە چرایە
(نالی) کە ویقاری نیە ، بێباکە لە (خەڵکی)
سۆفی کە سولوکێکی هەیە عوجب وریایە

٣

زوڵفت بە قەدتدا کە پەرێشانو بڵاوه
(بۆچی) لەمنی شیفتە ، ئاڵۆزو بەراوه
بۆچی نەگرێم سەد کەرەتم دڵ دەشکێنی
مەی بۆ نەڕژێ ، شیشە لەسەر (جێگە) شکاوه
هەر چەندە کەرووتم بەخودا مائیلی رووتم
بێبەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوه
هەر جۆگەو (جێتێکی) کەوا سوورو سوێربێ
جێ جۆششی گریانی منە ، خوێنە رژاوه
سۆزی دڵمە باعیسی تاوو کوڵی گریان
مەعلوومە کە ئاگر ، سەبەبی جۆششی ئاوه
بێ فائیدەیە مەنعی من ئێستا کە لە گریان
بۆ عاشق بێچارە زوو ئەم ئاوه رژاوه
مانی ی نیەتی قووەتی تەسویری بڕۆی تۆ
ئەم قەوسە بەدەستی موتەنەففیس نەکشاوه
(نالی) وەکو زوڵفت کە موتبعی بەری پێتە
تێکی مەشکێنە ، بەجەفا مەیخەره لاوه

* * *

لە لاپەڕه (٢١–٢٢)شدا ، شیوەننامەیەك لە لایەن

رۆژنامەنووس و شاعیرو زمانزانی نەمر (محمد میهری)و بەبۆنەی کۆچی دوایی (بابان زادە اسماعیل حقی بەگ) بلاوبۆتەوە ، ئەمە دەقەکەیەتی [٧] :

زمـانی پیرەمـێرد ئـیـمـرۆ خـەزیـنـەی ئـێش و گریـانـە
شەوو رۆژ ئـاهی نـالی رەعـدە ، ئـەشکی چاوی بارانـە
هـەناسەی ساردی (تەئیر)ی لەخاك تاکو (ئەثیر)ی چوو
مـیـزاجی ئـیـتعتیدال فەوتا ، و یسالی تۆفی زستانـە
لـەتـەم سەرپۆشی غـەم پۆشی سەراپا قـامـەتی کـێوان
دڵی تۆران دڵی سەردی لـەبـەین کـێوانی کـەیوانـە
بـەرەسمی تـەعـزیە هـەر نەونەمامە بەفری کورد جامە
بـەڵێ لـەبسی سپـی پۆشین رسوومی کۆنی دەورانـە
لەدەوری سەر لـەبـەر پـێی نـەوعروسانە چەمەن پۆشین
خـەتی خـاڵی پـەرێشانـە ، خـەزانـە پـەلـکی رێزانـە
لەحەسرەت هاتە لەرزە ، هەر نەمامێك قامەتی بەرزە
مـەگەر تـابی تـەبش ئـەفـتـانی خێزان ، کاری ئەحزانە
لـەسەر تـاپـێ بـەزنجیری سەهۆڵو پـێچـراوە بـێچـارە
سەهۆڵی دەردی حوزنـە ، فـا ئیدە.ی زنجیری دێوانـە
لـەهـەر مـاڵێ تـەماشاکەی لەسەوبی سینە دوکەڵ دێ
لـەنـاو کوردان دەڵێی «(فارالتنور) و وەقتی تۆفـانـە
بـرا حـیبرو درا کـاغـز قـەڵەم جـیسـمـی شکـاو رەسمی
بـەسەد شکـڵو بـەسەد شێوە دەگرێیت هـەنـدە سەخانە
لەباغی عیلمو تەحسیلی هەریەکێ لەو تازە غونچانە
لەسەر لێو باری دڵ ، ئەفکاری تەعتیل کاری حەیرانە
لـەسەر سەفـحـەی گوڵی روومـەت لەئاڵی شەونمی گریان
پـەرێشانن چ وەقتی خوێنـدنـە ، یـا لـێوی خـەنـدانـە
خودایـا رۆژی حـەشرە وا جیهـان یـەکسـەر سەروبن بوو
وە یـاخود وەلولـەی فـەوتی مـەداری فەخری کوردانە
جـەوانی نـەوجـەوان حـەقی بـەگ ، بـەگزادەیی کوردان
رەئـیسی ئـەهلی عیرفـان ، دەریـەکـتـای مـاڵی بـابـانـە
لـەبـەر کۆچـکـردنی دەردانە ئـیـمـرۆ رۆژی دەردانـە
مـەسیلی ئەشکی خوێن دامانە ، دامان کاری مەردانە
بڵێ ئـەمـری خودایـە هـیچ لـەدەستی ئـێمـە دەرنـایێ
کە قوربان زوو بەکورد ، بۆچ تازە ئیسماعیلی قوربانە
ئەجەل ساق سەعات پەیمانە شەربەت مەوتە بۆ هەرکەس
دەگەڵ ئەو مەجلیسە رۆژی ئەزەل سەد عەهدو پەیمانە
لەبۆ تـەئریخی مەوتی (میهریا) هەر چەندە مەحزوونی
بڵێ دوو میسرەعی مەربووت و مەزبووتی ئەدیبانە
(خـدا عـفو بـکـە نـاکـامـران بو هـم نـبو جوانی
لـە دنـیـا کوچـی کـرد چوو لبر دەرگایی تو مـهـران)

* * *

لە لاپەرە (٢١-٢٤) شدا سەروتارێ بەناوی (تەرەقی دینان دەوێ) تۆمار کراوەو لە کۆتاییدا نووسەری وتار هەواڵی کردنەوەی قوتابخانەیەکی کوردیەو بە زمانی کوردی لە شارۆچکەی شەرەفکەندیو لەلایەن (مەولانا حاجی مەلا محمدی صادق) بلاوبۆتەوە .

ناوی خۆیشی بەمجۆرە تۆمار کردوە :

(سابلاغ - قازی زادە - مصطفی شوقی) [٨]

ئەمەش پوختەی دەقی وتارەکەیە :

«چەندێك لەوەی پێش بەواسیتەی رۆژنامەی (هەتاوی کورد) لە خوسووس فایدەو مەنفەعەتی مەکتەب چەند سەترێکم عەرز کردبوون .

ئاغایانی موحتەرەم عەرزی ئێمەیان قەبوول فەرموو . وادیارە کە الحمدلله حەمییەتی کوردان هاتۆتە جۆش . مەخسووس شوکر دەکەین . ئێمە کە موسڵمانین ، ئیعانە کردنی یەکترمان لەسەر لازمەو حەتا پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی : (من نفس علی اخیه کربة من کرب الدنیا نفس الله عنه کربة من کرب یوم القیامة ، والله فی عون العبد مادام العبد فی عون اخیه .) یەعنی کەسێك لەسەر برای خۆی - مەتڵەب برای موسڵمانەو چونکە هەموو موسڵمان پێکەوە بران - انما المؤمنون اخوة - غەمی دنیایە دەفع دەکا ، خودا غەمێکی قیامەتی لەسەر

هەڵدەگریٚو خودا ئیعانەی عەبدی دەکا مادامەکی ئەو ، ئیعانەی برای موسڵمانی خۆی بکا . . . تاد

مولاحەزە فەرموون ، چەند ساڵ پێشتر لە شاری سابلاغی‌و ئەترافی وی ، بەچ جۆرێك عیلم‌و فەزڵ دەتەرقی دابیٚو چەند مەلای وەکو : عەلی تورجانی‌و مەلای پێنجوینی‌و مەلای پیرەباب‌و مەلا وەسیم ، بەوجودی خۆیان عالەمیان موزەیەن فەرموو بوو . چەند کەس لە ئەهلی تەریقەت‌و لە پیرانی دڵرووناك بە ئیرشادی خۆیان رەونەقیان بەدینی ئیسلامی دابوو . دەگەڵ تەئەسوفی حاڵی حازر لەهەزار فەقێیان مەلایەکی واو لە هەزار موریدان پیرێکی وا نابیٚ . بۆچی ؟ بەبیٚ شك دەفەرموون :
- چونکە وەقت هەتادیٚ خراپتر دەبیٚ - بلاٚ ئایا ئیمە لە موقابیلی ویدا نابیٚ حەرەکەتێك بکەین ؟ دەبیٚ هەروا مەئیووس‌و نائومێدبین ؟ ئایا بەخراپی ، ئەودەمی تەکلیفی شەرعمان لەسەر وەلا دەچیٚ ؟ . . .

رجاو لێدەکەم چلۆن کرمانجانی لادیٚ کە لە هەزاریان دوویان بە تەواوی فاتیحەو نوێژیٚ نازانن . دورستە پێیان بلێی : موسلمان . . . ؟ عولەمای ئیمە ئەگەر ئەمر بە مەعروفیان لەکن واجیبە . بۆچی بەبیٚوی کە ئاغایەك ساڵی سەد تەغار گەنمیان نەداتیٚ ، تا فاتیحەو نوێژیان پیٚبلێن . دیارە کە ئەوان کەمتر فیکری پاشەرۆژیان هەیە . کرمانجی فەقیر زوو مردوویان . . بە ئیستیلاحی خۆیان - بەبیٚ چەقۆ دەمرن‌و تەلقینیان دانادریٚ . . . !

ئیمە هیچ ناڵێین : کە عیلمی دنیایە نخوێنن دەگەڵ ئەوەش وامەکەن کە عیلمی دینیشمان لەدەست بروا . . ئەرمەن ئیستا ئینجیلیان بە (کوردی) تەرجەمە کردوە : ؟ توخودا ئەی ئەهلی ئینساف ، دیققەت بفەرموون . کوردێك کە نەزانیٚ محمد (ص) کیٚ بووەو لەکویٚ وەفاتی فەرموەو . . شەریعەت چیە . . ؟ چلۆن دەتوانیٚ دینی خۆی راگریٚو لە موقابیلی واعیزی فەرەنگییان کە بە زبانی لووسیان شەیتان هەڵدەفرویٚ . هەڵنەخەڵەتین . . ؟

ئایا ئەگەر زەمانە وا دەوام بکا . ئیمە چمان لە خەڵکی دنیایە زیادترە ؟ کە بە دووسیٚ پشتان دەگەنە موسلمانان بۆ خۆشیان کافرن . . ! لە یەکێکیان پرسی :

نێوت چیە ؟ دەڵیٚ نیقۆلاٚ . . نێوی باپیرت ؟ پەترۆس . . نێوی بابی باپیرت چیە ؟ دەڵیٚ : ژۆرژ . . نێوی باپیری باپیرت چیە ؟ دەڵیٚ : محمد . . . ! دەگەڵ ئەوەی کەسیٚ پشتی پێشوویان موسلمان بووە ئەوێستا کافرن .

عیلاجی ئەو دەردە ، دوو کەلیمەیەو بەس : (کتێبی شەرعی بەکوردی تەرجەمە بکریٚ) . . ئیبن حەجەرێکی فەقیٚی فەقیر ، پاش (بیست) ساڵ خوێندنی تا بزانی . . چ عەیبێکی هەیە بەکوردی تەرجەمە بکریٚو بە (دوو) ساڵان ئەو فەقیٚ فەقیرە فێری بیٚ ؟ مەقسەدی ئیمە ئەوەندەیە . . . نیشانی تەرەقی بەختە کە ئاغای محمد حسین‌خان سەرداری موکری ، کە خانەدانێکی نەجیبەو حاکمی سابلاغی‌یە ، بە سەفەحاتی حەمیدیەیٚ خۆی مەشغوولە کە ئەو مەعروزاتی ئیمەو مەفهووماتی رۆژنامەی موحتەرەمی (هەتاوی کورد) لە قووەتابیٚو خودا دەوامی بدا . . وەخسووس کە جەنابی (مەولانا حاجی محمدی صادق) عەزمی فەرمووە کە لە -شەرەفکەندی- مەدرەسەیەکی بە (زوبانی کوردی) بینا بکەن . ئیمە دڵمان دەجۆشیٚو پر دڵەخوێن . . !

مولاحەزە فەرموون : ئەگەر قسەکەمان خراپە . وەیا زەرەرێکی بۆ دینی موبینی تێدا هەیە . دەگویٚی مەگرن .

وەگەر خۆشی‌و باعیسی تەرەقی دینی ئیسلامی‌یە - لا تنظر الی من قال وانظر الی ما قال - قسەکە دەگویٚی بگرن‌و ئیمە مەناسن : (مردبایدکه کیرد اندرکوس - ورنوشت (ست پندبر دیوار) والسلام علی من اتبع الهدی .

«سابلاغ - قازی زادە مستەفا شەوقی»

* * *

لەلاپەرە (٢٤-٢٥) شدا . بەنازناوی (کردستانە برخطاب - پەیامیٚ بۆکوردستان) کە شیعرێکەو لەلایەن (حاجی حسن تحسین سیوەرەکی) مودیری نفووسی شاری ئاینتاب تۆمارکراوەو

دەقەکەی دەڵێ :

سالاّ چارانە حەموو دوژمن هاتن بسەرمەدا
ئمیداد نەهات کافر پڕن بسەرمەدا
وەلات گرتن پیاو کوشتن کەسەك نەما
تالان کرن قیزن برن ناموس نەما
خەلقیٚ رۆمیٚ مللەتا ئەرنا ئودان جەزای کر
پاشی نەهات بهەڤ کتەك (قرلوید) کر
سێسەد ساڵە ئەرنائودان میّرانی کر
نانیٚ زگان خارن ، صۆغین جەزای کر
کوللی عەشیران هوون هشیار بن
شوورو مەتالان بگرن ، رابن
خودا هەیە غەم توونە
ئمیدادیٚ نەخالق توونە
غیرەت بکن هوون بیەك بن
پاشیٚ خرابە ، دەستا بهەڤدن
هاوار دکم لە کرمانجا
رۆژا ناموس‌و رۆژا میّرا
سوڵتانی دینی هوون مەترسن غیرەتا دینە
گازی بکن لەویٚ زاتیٚ باڤ مەزن سوڵتان صلاح‌الدینە

* * *

له لاپەڕە (٢٥-٢٦) شدا ، بەناوی (گازندەئیٚ کوردان) لەشاری (وان)و لەلایەن (فؤاد تەمۆ) وە هاتووەو دەڵیٚ[٩] :

مەزنا کوردان ئەزیٚ تشتەك بیژم وەرا
گەرما گوهداری بکن مابیژن درەوا
ئیرۆکا وار رازاندنە ، خەبات‌و خاندنە
راست بزانن ژڤیٚ ریەکی راست‌و تونە
* * *

جارەك دەستیٚ خۆدانن سەر سنگا
بۆ دل خۆ بپرسن ئەم بوچی مان پاشدا
مللەتیٚ کو نەخاندنە نەزانین
مەحکومیٚ مرنە ، ئەڤیٚ قەنج بزانین

* * *

بزانن ئەو حی‌داریا ئەم کەتین تیدا
نکارن خۆ دەرخەن ما نەنا ڤرا
مللەتیٚ‌مە نەخۆشیا ، نەزانی‌ییٚ گرتیە
هەکیم تونە شوخا ئەڤە ، دل‌من سوهتیە

* * *

ئەم گازی دکن هیکمەتیٚ بکن مەرا
دەمیرن ئێدی بەسە ، وەرن هەوارا
دەرمانەکی بدن نەزانی‌ییٚ سەرمە راکن
بریندارامە مەزنە ، هوون چارە بکن

* * *

ئەڤە ستۆلی وەیە ، مەریژن ڤیردا ویدا
ژوە گازندە دکە ، هەموو خەڵقین کوردا
مرن هەیە ئەو خەونەك گرانە
هاڤین چوو ، نها گاڤا ، خەزانە
دەست باڤیژن کیس بدرن ، زیرو زیڤا
مەکتەب‌و مەدرەسە چێکن بۆ کوردا
هەرکی مەکتەبەك بۆ کوردان ڤەدکە
ئەوە کو ناڤا مرۆڤ بلند دکە

* * *

هەر له لاپەڕە (٢٦) شدا ، بابامیری محمد حسین خان سەرداری موکری‌و حاکمی سابلاّغ پیرۆزبایيەکی بەسۆزی بۆ (هەتاوی کورد) ناردووەو دەڵیٚ :

«ئاقای‌من چاوم کەوت بە رۆژنامەی (هەتاو) وابزانە کە هەموو دنیایان دا بەمن ، چونکە تا ئێسە ئەو مللەتە کە لە پێش‌دا لە هەموو میللەتان مەشهورترو ئازاتربوو . ئەورۆ بەدبەختی رووی تێکردووەو بەدبەختیان گەورەترە ، ئەوە بوو کە بە زبانی خۆمان کتێبمان نەبوو ، رۆژنامەکمان نەبوو . ئەدەبیاتمان نەبوو ، مندالّی ئێمە کە بیانخوێندایە دەبوو بە زمانی فارسی یا

تورکی بخوێنن ، شوکری خودا که ئەورۆ له ئەسەری قەڵەمی جەوانانی غەییوری ئێمە ، دوو رۆژنامە بە زبانی کوردی چاپ دەکرێ . لەسەر هەموو کوردان لازمە قەدری ئەو زاتە گەورانە بزانن و بەهەموو تەرزێ لەپێشرەفتی ئەو مەقسودە موقەددەسە کە ئەو دوو وجودە موحتەرەمە ، عبدالعزیز بەگ لەپێشیان کەوتوە کۆمەك بکا ، بەڵکو انشاءالله میللەتی کوردیش بێتە عەرەسەی تەمەددون و بە زبانی خۆی نەشری مەعاریف و تەئلیفی کتێب و تەئسیسی مەداریس بکا ، تا لەوە زیاتر لە خەوی غەفڵەتدا نەمێنن ، خواهیش و تەمەننا لە ئەو دوو زاتە موحتەرەمە دەکەم ، هەموو مانگان رۆژنامەی (هەتاوی کورد) و (رۆژی کورد) رەوانە بکەن ، کە چاوم بە تەماشا کردنی ئەوان روون دەبێتەوە .

قیمەتی ئابونەم رەوانەکرد ، لە حاجی زین العابدینی تاجیری تەورێزی وەرگرن . انشاءالله لەوە بەدواوە ئیعانەش دەنێرم ، بەگیان و بەدڵ بۆ هەموو حەدس حازرم . . . » .

(هەتاو)یش بەمجۆرەو بە (تورکی) وەڵامی داوەتەوە :

«نووسراوی سەرەوە هینی حاکمی ساوجبلاغی ئێرانە.

سوپاسی هیممەت و هاریکاریەکەی دەکەین . نیازخوازین نموونەیان زۆرتربێت . . . »

* * *

لەلاپەرە (٢٧-٢٩) شدا ، هەمدیس لە شاگردانی (مدرسة الزهراء الرشادیه) محمد شفیق) ناوێ(١٠) بەناوی ئەوانەوە . وتارێکی دیپلۆماسیانەو بەنرخی – بە شێوەزاری بۆتانی – رەوانە کردوەو تێیدا زۆر بەوردی باسی دووبەرەکی و ململانێ و خۆخۆری نێو کوردان دەکات و لە پاڵیشیا باسی راپەرینی گەلی کورد دەکاو جاری بەهای سەرفرازی و گیانی شسەندووی کوردایەتی ئەدات و لە برگەیەکا دەڵێ :

«لازمە ڤیجار ، ئاوابی عەقلێ مە دکهتی ، لەورا هەر کەسەکی گەورە عەقلێ خوە خەبەر دده ، کو هەند مرۆڤێ عارف و موتەددەینی بەغیرەت و حەکیمی بێ غەرەز و عەوەز . موهەییا بن ژ تەرەڤێ حکومەتا مەبێ ئیسلامی . ڤێ مللەتێ ئیسلامی نەسحەت بکەن . . . تا»

* * *

لەلاپەرە (٢٩-٣٠) شدا ، هەمدیس لەلایەن (مدرسة الزهراء الرشادیه) وە (حەمزە) ناوێك بەناوی (ژبۆ هەتاوی کورد) شیعرێکی بەجۆش و کوردانەی ناردوەو ئەمە دەقەکەیەتی(١١) :

السلام ئەی گەنجێ ئەکراد . صەدر بالا جێ نشین
کوردێتە ، مەدیونێ شوکراناوەیە . هەر ئانو حین
عاقل و زانا ژبو وە شاکرن هەردەم ... مەدام
چونکە دەرسێ ئینشاهیێ دکەڤن ئەو خاس و عام
واقیا ئوستادو فەزل و ئینتباهێ وان دڤێن
لێ چکن حەتتا نهو بن بەرفا حیلدار دزێن
زاهیرە جەم وان وەکی رۆژ ل شەرقێدا دیار
رۆژو تاڤەك گەر هەبت هەردێ سەرووەت بت ئاشکار
وەك وەیە لازم دبین هون وەکی خەتتا حەدید
سەرمەدا دائیم بریژن عیلم و عیرفانەك سەدید
حاجی قادر (م . خ) ئەلحەق دبین عیللەتێ
چارە دخازن بکن ، دەرمان بکن وێ تیرکەتێ
لێ بەلێ عیللەت وەکی سەد ساڵەو کوهنەبێ
هەروەکی تیفۆقلەر مودهیش و جەووال بێ
لازمە دقتۆر – تەبیب ژێ میسلی لوقمان با ئیعتیدال
دانن دەرمان و دەوا . کو نەشئەت نەکت زددی منال

* * *

لەلاپەرە (٣٠-٣٢) شیعرێك و ئاخافتنێکی سیاسی و کۆمەلایەتی (محمد زکی مەلا جەلی) ناوێ ، هەمدیس لە (مدرسە الزهراء الرشادیه)ی شاری (وان)ەوە ناردویەتی و لە شیعرەکەدا ئەڵێ و دەقەکەش بەم شێوەیەیە :

حوریەت رۆژا کو ژ مەشرووتە تلووع کر
شەوق ـــــــــــــــــــەك دابو کوردان

ئيجلاس كوكربو ئەو لسەر تەختىٚ حەمييەت
تـــاجىٚ وى ژغيرەت
ئەز چوومە سەرا پەردەئىٚ بەر سەڵتەنەتىٚ شاهـ
من ديتى كو گريـــان
حوزنىٚ (غضـــبنـــاك) ژ فريادىٚ دكر ئاهـ
مـــانـــەنـــدى يـــەى
ئەز چومە حزورىٚ بەسوئالو بە جەوابان
چوبوومـــە زيـــارەت
سەعيامە كو مەشكوربو ، بقەيدانو كيتابان
زيـــارەتبو عـــيـــادەت
چەند سالە دريژن لە هەر كەللەبى تيران
ويجدانىٚ جـــەوابـــدا
ئەز فريەبى شەكو كو دكن دوشمن و جيران
راهىٚ نـــەسەوابـــدا
هەم تەعنەو هەم لەومە . . . . . .
غـــەدرەك موتـــەكـــەميـــل •
چاف دانە درەو رورەشيا ئەهلى سەليبان
من نـــيـــنـــە تـــەحـــەمول
پەيمان مە دگەل كريە كو ئەز ببمە مودافيع
سەر لـــەومـــەتى لائيم
دەر بەحرىٚ جيهادا ڤىٚ سەبيلىٚ ، ببمە رافيع
بـــا قـــەلـــعـــەبى زالم
ئيروژ ڤەكر تاڤىٚ لسەر كورد بناليد
مـــەوسيم تـــە بهارەت
هاڤين بىٚ دسوژى گەر شيتابىٚ دبىٚ تەبريد
پـــايـــزىٚ نـــە مـــەنـــبـــەت
بنڤيٚمە ئەيا بابو برابىٚمە ب قوربان
دەردىٚمـــە فـــەقيران
بشكيٚنە قيوا دوشمن جيران بكە سەگبان
ئـــەى بـــابىٚ ئـــەسيران

كوردىٚمە قەوى موستەعيدن مانە بەلاڤە
وەك لوئـــلوئى مـــەنسوور
حەبلىٚمە مەتينە حازرو هەم پڕ بشەفافە
دەرزى نـــيـــە مـــەنـــزوور
«روسيا» كو دگەل روىٚ سيەهـ نەوطە چەواندا
پـــڕ ئـــەهلى عـــيـــنـــادە
يـــەكىٚ دى بـــفـــەزانـــدا
مـــەقسودىٚ فـــەسادە
شەرقىٚ ئەنا دۆليٚدا لكوردان بويە تەفريق
لـــەو دەنگى سەگانتىٚ

ئـــاهـــيٚن ژ دلانتىٚ

* *

ئينجا دەست بە ئاخافتنەكەى دەكاو لە برگەيەكيدا دەڵىٚ :

«گويا حوريەت ژ عوومومى عەناسرى عوسمانياندا . حاكميەتا ميللەدانى ، يەعنى هەر ميللەت بو خاوەنى ناموسا خوە ، كوكەس نكارە تەعەروز ليٚبكەت . يەعنى لسەر وە جەكوبوريە ، دنزميٚدا ناموسا ميللى ژمەرا ، كرە پادشاهەكى مەعنەوى . . حال ئەو حالە . ئيسال چارپيٚنج سالى مەشروتيەتىٚيە . دائيمەن ناموس كورد . چاوان بوويە هەدەف ژيٚ ئيفتيراو مەيكايدىٚ . وەسابوويە ئارمانجا لوٚمەيىٚ مەزنىٚمە . ئەگەر ژ حكومەتىٚو ئەگەر ژ ئەدبىٚ كوردان . حەتتا حەميان ئارىئاريا هەڤكرن . عەزمان دانە دوژمنان . هەر بەڤىٚ تەرزىٚ كوردان ژ فەنى يەئس دان . ئيعتيقادا فيتريا وان كول خەراب كرن ، قووەتا مەعنەوى شكاندن . . . !

بەردەوام دەبيٚتو دەڵىٚ :

هەرووەكى مەسئەلا ئيسلاحا حروفان ژكورد – انرا خوجە درنبد نقش ايوانست . خان از بى بستو برانست – ديققەت بكەن ئيروٚ چاڤ ئەهلى سەليبان ليٚيە . كو حەسيبەتا دەولەتا ئيسلامىيە لەكەدار بكەن ، هەشتنە مليوٚن كوردا يەك دەفعە

بمرینن . . . !

ئەز مەجبوورم ، موەززەفم ، موکەللەفم بسورەتیٚ نازداریٚ ب‌لیسانەکیٚ حەق مودافەعە بکەم ، عەجەبا وەچەند مەکتەب‌و مەدرەسە ، یا چەند سالە ژکوردانرا چێکریەو چەند پارەییٚ خۆ لکوردان‌و لە مەعاریفیٚ‌وان سەرف کریە . . . !

تا بەردەوام دەبێت‌و بەجۆشەوە دەکوڵیٚ ودەڵیٚ :

مەسئەلە وە دەمێنتە مەسئەلا ویٚ باب ، کو ئەولادیٚ خۆە نەدانەتە بەریٚ خویندن ، حەتتا حەمی مەزن ببن ، رۆژەکیٚ دەفعەییٚ ببێژە وەرن حەمی علوومان ژمەرا بخوینن . . . !

ئەم ئومێدلی‌و مونتەزیرین کو ئەم ژ ئیستفادەکی ژمەسئەلەکا ، وە موستەقیم بکەن‌و مەنافیع بینە تەعمیم . السلام‌علیکم یا معشرالأخوان . . .

## پەراوێزو سەرنج‌و رابینین :

(١) – لە کتێبەکەی (کورد) دا مێژوسکی لەبارەی رێکخراوی (هیڤی)و (رۆژی کورد) و (هەتاوی کورد)ەوە دەڵیٚ :

«لە دوایدا کۆمەڵیٚ لە کوردەکان ، لە قوتابی‌و رۆژنامەنووسان . لە ساڵی ١٩١٣ دا ، کۆمەڵەی (هیڤیا کورد) یان دامەزراندو دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی مانگانەو بەناوی (رۆژی کورد)ەوە ، ئەم گۆڤارە رێرەوێکی نەتەوەیی رووی گرتبووەبەر . لەپاشاو لە ساڵی (١٩١٤ . . . !) دا ناوی گۆڕاو بوو بە (هەتاوی کورد) . . .

مێژوونووسی نەمریش محمدامین زەکی لە (کوردوکوردستان)ـە کەیدا دەڵیٚ :

«لەدوای ئیعلانی مەشرووتیەت ، لە تەرەف جەمعیەتی (هێوی کورد)ەوە مەجموعەیێکی ئوسبوعی بە عینوانی (رۆژی کورد) لە ئەستەموولٚ نەشرو لە دوو نوسخەی ئەوەلیدا ، رەسمی سولتان صلاح‌الدین‌و کریم‌خانی زەندی تیابوو . ئەم نوسخەیە لە (٦)ی حوزەیران - تەمووزی (١٣٢٩) دا لەتەرەف عبدالکریم ئەفەندی خەڵکی سلێمانییەوە نەشرکراو لەپاش بەینێك ناوی گۆڕاو بووبە (هەتاوی کورد) . . .

مامۆستای نەمریش علاءالدین سجادی لە (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا بەمجۆرەو ئەتەك گۆڤاری (رۆژی کورد) ئەم (هەتاوی کورد)ەی تێهەڵکێش کردووەو دەڵیٚ :

«ئەم گۆڤارە – رۆژی کورد – لەپاشا ناونرا بە – هەتاوی کورد – عبدالعزیز بابان هەر بەمانگی جاریٚ ژمارەیەکی بەکوردی‌و تورکی لە ئەستەموولٚ لیٚ دەرئەکرد . یەکەم ژمارە لە (١١)ی تشرینی یەکەمی (١٣٢٩) رۆمی (١٩١٣)ی میلادی بووە . وێنەی عبدالرحمن پاشای بابان لەم ژمارەیەدا هەیە . . .»

لە لێکۆڵینەوەیەکی کاك جمال خەزنەداردا ، دەربارەی (رۆژی کورد)و (هەتاوی کورد)ەوە ، ئەوەی روون کردۆتەوە کە :

«لەپاش دەرچوونی سیٚ ژمارەکە ، لە گۆڤاری (رۆژی کورد) هەربەو قەوارەیە لەژێر ناوی (هەتاوی کورد) ژمارەیێکی لیٚ‌چاپکراو بەژمارەی (١) دەستی پێکردوە . واتە : ژمارە (٤)ی لەسەر دانەنراوە ، وەکو بەردەوامی (رۆژی کورد) . .

هەروا مێژووی دامەزراندنی مانگی ذی‌العقدەی بۆ دانراوە . . ساحێبی ئیمتیازو مودێری مەسئوولی عبدالعزیز بابان بووە . . ژمارەکە لە رۆژی (٢٣)ی ذی‌القعدەی (١٣٣١)ی هیجری رۆژی (١١)ی تشرینی یەکەمی (١٣٢٩)ی رۆمی دەرچووە . بەرگەکەی بەوێنەی ئەورەحمان پاشای بابان رازاوەتەوە . . .»

لەپاشا لەدەمی مامۆستا دوکتۆر ئیحسان فۆادەوە بەردەوام ئەبێت‌و ئەڵیٚ :

«ئەم زانیاریەمان لەو نووسخەیە وەرگرتووە ، ئەوەی دوکتۆر ئیحسان دیویەتی . . . زامدار – ئەوەبووە سەرچاوە . بۆ هەموو زانیاریەکان لەبابەت (هەتاوی کورد)ەوە . . لە لاپەڕەی دوایی ئەو نوسخەیەدا بەزمانی تورکی‌و بەخەتی عبدالعزیز بابان ئەم رستەیە نووسراوە :

«گەورەمان سەید ئەحمەد ئەفەندی . . بەپیٚ‌ی ئارەزووو داوای شێخ‌عبدالقادر ئەفەندی (رۆژی کورد) وەستێنرا . . ئێستا لەباتی ئەو هەتاوی کورد) بڵاودەکرێتەوە . . .»

کەچی ئەو ژمارە (٣) پەی لەمەڕ مندایە - وەك گوتم بەپیٚ‌ی داوایەکی من‌و لەوەڵامی لێکدانەوەیەکی مامۆستا کریم‌شارەزا ، بەراوردەکە وادەرچوو : (-١٣٢٩-ی رۆمی مانگی تشرینی دووەم بەرامبەر بە مانگی ذی‌الحجەی -١٣٣١- هیجری قەری بەرامبەر بە (١٩١٣)ی مانگی تشرینی دووەمی زایینی . . .» .

ئەمەیان بۆ ژمارە (٢)ی ئەم گۆڤارە ئەشیٚ وراستە . ژمارە (٣)یش دیارە لە کانوونی یەکەمی هەر ئەو ساڵەدا دەرچووەو ئەبیٚ ژمارە (١)یشی هەر لەو ساڵەو لە سەرەتای تشرینی یەکەما دەرچوویٚ ، وەك چۆن سەرچاوە باوەر پێکراوەکانیش ئەمەیان سەلماندوە . وەك کاك جمالیش ئاشکرای کردوە ئەو ژمارە (١)ی ئەو گۆڤارە تەنیا دوکتۆر ئیحسان بینویەتی‌و بەس . ئەوەی هەیەو ماوە تەنیا ئەم ژمارە (٣) یەی لەمەڕ مندایەو بەس . . . ! تاکە بەڵگەیەکەو بەس . . . !

کەواتە : ئەم (هەتاوی کورد)ـە ، گۆڤارێکی سەربەخۆ بووەو سەرنووسەرو دەستەی نووسەرانی خۆی هەبووە . بۆ سەلماندنی ئەم رایەشم . نامە راشکاوەکەی سەرداری موکری‌و حاکمی سابلاغی‌یە کە لە لاپەڕە -٢٦-ی ئەم گۆڤارەدا ئەڵیٚ :

«تەمەننا لەو دوو زاتە موحتەرەمە ئەکەم ، هەموو مانگان رۆژنامەی (هەتاوی کورد)و (رۆژی کورد)م بۆ رەوانە بکەن . . .تاد»

ئەمێنێتەوە سەر شتیٚ ئەویش ئەوەیە کە : دوور نیە ئەم گۆڤارە ، هەتاوی کورد- پاشان و دوای وەستانی (رۆژی کورد) بوویٚ بە ... گانی رێکخراوی هیڤی . ئەمەو لەنێو لاپەڕەکانیشیدا زەق‌و ئاشکرا دیارە کە ئەم گۆڤارە گەلیٚ رووناکبیری جگەرسۆزی ئەو سەردەمەی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان دەورەیان لێداوەو لەوانەشە زوربەیان سەر بەو رێکخراوە بووبن . . هەروەك چۆن (بانگی کورد)ی بەغداش زمانحاڵێکی کەی هەر ئەو رێکخراوە بووبێت . . . ! !

(٢) – وادیارە ئەم کەرکووکی‌یە ، لە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە بووەو لە (رۆژی کورد)یشدا گەلیٚ وتاری ئاگرینی بەتورکی‌و بۆ کوردایەتی بڵاوکردۆتەوە . وەك بۆیشم ساغ‌بووەوە ، ئەم نجم‌الدین ئەفەندی‌یە – نجم‌الدین شێخ حسین نەقشبەندی ، براگەورەی (ئەسیری)ی شاعیرە وهەر لەم برایەشیەوە فیری گیانی نیشتمانپەروەری بووە . . لەوانەیە . . . !

(٣) ئەم وتارە بەخامەی خاوەنی گۆڤار عبدالعزیز بابان تۆمارکراوە

(٤) – بۆ یەکەمجار وەك‌من بۆی بچم (زێوەر)ی شاعیر بەرهەمی خۆی لەم گۆڤارەدا بڵاوکردۆتەوە ، بەڵام ئایا (زێوەر) ئەمەی لە ئەستەموولەوە ناردوە یا لە سلێمانی یا لە شوێنێکی ترەوە .

یا هەرخۆی سەر بە رێکخراوی (هیڤی) بووەو لەرێ‌ی ئەوانەوە گەیشتۆتە گۆڤارەکە . یا ئەمیش یەکیٚ بووە لە دەستەی نووسەرانی ئەو گۆڤارە . . پرسیارە . . ! ؟ بەڵام کاکە حەمەی مەلاکریم لە پێشەکی کتێبی (گەنجینەی مەردان)و لەبارەی مەلا عبداللەی زێوەرەوە ئەڵیٚ :

«لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا چووەتە ئەستەموولٚ‌و سیٚ‌چوار ساڵ لەویٚ ماوەتەوە . .» لام وایە

وەلأمەکەی ئاشکراو دیارە . . . !

(٥) – قەسیدەکەی (حاجی) تەمەنی (٧٥) ساڵەو یەکە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی چاپکراوەو ئەبێ بێ – بەرای‌من – بە بنچینەی ئەو قەسیدە ناودارە (ئودەبا . . .) بە بەراوردیش لەگەڵ چاپەکەی (مامەگیوی موکریانی)و مامۆستایان کەریم شارەزاو سەردار میران) دا ، جیاوازیەکی زۆر زۆر چ لەجی‌گۆڕکیی وشەو چ لە جی‌گۆڕکیی تاکە بەیت‌و چ بوونی چەند بەیتێکی تازەدا هەیە . . مایەی پێداچوونەوەو سەرنجە . . ! خۆ گەر هات‌و دەسنووسی باوەرپێکراوو کۆنتری لەم چاپکراوە هەبێت – کەتا ئێستا نیە – ئەمەیان باسێکی ترە . . . !

(٦) – لە گەلێ شوێنی هەر سێ قەسیدەکەی (نالی)دا ، گەلێ جیاوازی لە جی‌گۆڕکێ‌و لە (وشەدا) هەیەو جیاوازی لەگەڵ هەردوو دیوان‌و لێکۆڵینەوەکەی مامۆستایان (مەلا عبدالکریم مدرس)و (دوکتۆر مارف خەزنەدار)دا . . جا لەبەر ئەوەی ئەمە کۆنترین دەقێکی چاپکراوی ئەو سێ پارچەیەیە و تەمەنی (٧٥) ساڵە ، بەرای من ئەبێ ئەمەیان بێ بە (بنچینە)ی ئەو سێ پارچەیە . ناڵێم مەگەر دەسنووسی وا هەبێت لەم چاپکراوە کۆنتربێت و جێگای متمانەش بێت . . !

ئەوەی جیی سەرنج‌و تێرامانیش بێت ، قەسیدەکەی (حاجی) چونکە شیعرێکی سیاسی‌و رەخنەگرانەی کۆمەڵایەتی‌یە ، پێش شیعرەکانی (نالی) بلأوکراوەتەوە . . واتە : گۆڤارو خاوەنەکەی‌و هەڤاڵەکانی پتر بایەخیان بە لایەنی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و نیشتمانی داوە . . ! هەمووشمان ئەزانین شاعیرایەتی نێوان (نالی‌و حاجی) ئاسمان‌و ریسمانە ، بەلأم ئەم دیاردەیەو لەو سەردەمەدا لەلای رۆشنبیرانی جۆشخواردووی ئەو سەردەمەدا مانایەکی‌کەی هەبووە . . !

(٧) – بابانزادە اسماعیل حق بابان ، بەرهەمی ئاگرینی لە (رۆژی کورد)دا هەیە . .

(محمد میهری)یش ، کەڵە رۆژنامەنووس‌و شاعیرو زمانزانەکەی (ژین)و (کوردستان)ی گۆڤارە . . وەك دیاریشە قەسیدەکەی بە شێوەیەکی گشتی مۆرکی (کوردی‌یەتی) پێوە دیارەو ئەم پیاوە دڵسۆزە هەولی داوە ئەم زمانە پاکتاو بکات ، چونکە بەگوێرەی کوردیەکەی ئەو سەردەمەو هەتا نێو ئەو گۆڤارەش جۆرە هەوڵێکەو مایەی سەرنجە . . !

(٨) – لام وایەو ئێستا بەتەواوی موناقەشەکەی مامۆستایان (دوکتۆر خەزنەدارو ممتاز حەیدەری‌و کمال رؤوف) یەکالأبووەوە . . . لایشم وایە ئەمە یەکەمین وتارێکە – وەك بۆی بچم – ئەو پیاوە نەمرە لێرەدا بلأوی کردبێتەوە . . وتارەکەی خۆی لەخۆی‌دا درێژە پێدانی هەوڵی سەخت‌و دژواری یەکەم وەچەی راچەنیوی کوردو (مونەوەرەکانە) دژی ئیمپریالیزم‌و دژی جوولأنەوەی مسیۆنێرەکان‌و چەوسێنەرەکانی کورد . لەهەمان کاتا هاندانی کۆمەلأنی خەڵکی کوردستانە – لەرێی ئاینەوە – بۆ بە (کوردی) خوێندن‌و وەلأمێکی راستەوخۆو هەروا بەرپەرچکردنی جوولأنەوەیەکی کۆنەپەرستانەی ئەو دەورو دوکانەیە کە دژی کوردی‌و کوردی‌خوێندن بووە ، کەچی ئەم بەم شێوازە دیپلۆماسی‌یەو بەهێنانی نموونەی ئینجیلی کوردیەوە ، ویستویەتی وەلأمی کۆنەپەرستان بداتەوەو لەهەمان کاتیشدا خەڵکی کورد قەناعەت بەبۆچوون‌و باری سەرنجەکەی بێنێ . ئەمەو کردنەوەی قوتابخانەیەکی (کوردی)ش خۆی‌لەخۆیدا دیاردەیەکی روونە بۆ روونبوونی ئامانجی رووناکبیرانی ئەوساو هەروا دەسپێکردنی (قەلأچۆکردنی نەخوێندەواری . . . . !)

ئەمێنێتەوە سەرشتێ ئەویش کە : (د . کمال مظهر) لەکتێبەکەی (کوردستان لەساڵەکانی شەری یەکەمی جیهاندا) دەیلێ :

«چالاکی عبدالرزاق بەدرخان لەم مەیدانەدا بەوەوە نەوەستا ، لەسەرەتای ساڵی ١٩١٣دا لەشاری (خۆی) کۆمەڵێکی رۆشنبیری‌ی دامەزراندو نیازی وابوو چاپخانەیەکیشی بۆ دابنێ‌و رۆژنامەیەکی بەو ناوەوە دەربکاو لەژێر سەرپەرشتی ئەودا چەند (قوتابخانە)یەکیش بکاتەوە . . هەنگاوی هەرەگەورەو پرمانای‌ئەم کۆمەڵە ، بریتی‌بوو : لەکردنەوەی یەکەم فێرگە (قوتابخانە)ی کوردی لەشاری (خۆی) بەپارەی کۆکراوەی دانیشتووانی ناوچەکە خۆیان . . .»

ئینجا لە پەراوێزی لاپەرە (٣٨)دا مێژووی کردنەوەی ئەو قوتابخانەیە لەزمانی لازەرێفی رووسەوە تۆمار ئەکات‌و ئەڵێ :

«ئەم فێرگەیە لەرۆژی (٤)ی تشرینی دووهەمی ساڵی ١٩١٣ دا کرایەوەو بەم بۆنەیە لەشاری (خۆی)دا ئاهەنگێکی گەورە سازکرا ، ژمارەی یەکەم دەستەکەی شاگردانی ئەم فێرگەیە (٢٩) کەس بوو ، کەبەزمانی کوردی دەرسیان دەخوێند . . تاد»

جاگەر یەکەم (قوتابخانە) ئەمە بووبێ کە «لازەرێف»و دوکتۆر (کمال) تۆماریان کردوە ، ئەوا وەك لەنێو دەقی ئەم گۆڤاری (هەتاوی کورد)ەدا بۆمان بەدەرکەوت ، هەر لەو مانگ‌و لەو ماوەیەشدا قوتابخانەیەکی‌تر لەشارۆچکەی – شەرفکەندی – دا ، دامەزراوە . . ! هەروا بە دووریشی نازانم ، وەك دەرکی‌پی‌دەکرێ ، لەوانەیە سەرداری موکری‌و حاکمی سابلأغ لەتەك (قازی‌زادە – مستەفاشەوقی) کۆشش‌و هەولیان لەگەڵ عبدالرزاق بەردخان‌دا ، یەك بووبێ‌و لەو رێکخراوەدا ، کاریان کردبێ . . . !

(٩) – یەکەمچیرۆکنووسی کورد (فؤادتەمۆ) بۆ یەکەمجار وەك – شاعیرێ – نووسینی لێرەدا بەدەرئەکەوێ ، دیارە شیعرەکەش زۆر سادەو بێ سەروبەرەو مەبەستیش هەرهاندان‌و جۆشدانی خەڵکە و هیچی‌تر ، مەبەست مەبەستی هونەرو هونەربازی نیە ، وەك دیارەو دووریش نیە . ئەم نووسەرە نەمرە خەڵکی (وان) بووبێت ، چونکە شیعرەکە لە شاری (وان)ەوە نێردراوە . . . !

(١٠) – ئەم (محمد شفیق)ـە – وەك من بۆی بچم – هەر ئەو (محمد شفیق ئەرواسی) یەیە کەدیوانی شێخی جزیری بەچاپ گەیاندوەو لەپاشا لەگۆڤاری (ژین)ی ئەستەموڵیشدا بەرهەمی خۆی بلأوکردۆتەوە . . . !

(١١) – (حەمزە) . . دوورنیە – وەك من‌بۆی‌بچم – ئەم پیاوە نەمرەش هەر کەڵەرۆژنامەنووسی (ژین) ئەستەموڵ (اشرف حمزه) بێت .

(١٢) – (محمد زکی مەلا جەلی) دوورنیە – لام‌وایە – ئەم (جەلی)یە ، هەر لەرەچەڵەکی جەلیزادەکانی لای خۆمان بن‌و بەبنەچەك بۆتانی بن . . ! شیعرەکەش هەرچەندە (رقابە)ی ئەو زەمانە گەلێ شتی لی‌لاداوەو هەرچەندەیش بەکول‌وکۆڤانێکەوە باسی کورد دەکا . بەلأم بەرای من ، ئەم شیعرە هەر بەتەواوی لەکەشوهەواو پێوانەی کلاسیك دەرچووەو لەتەك دەقەشیعریەکانی بەر لەخۆی لەتەکنیکا یەك‌ناگرێتەوە . . باسێکەو باسێکی درێژو پێوەی خەریکم‌و پی‌ی ئەتلێمەوە . . . !

(١٣) – مایەوە ئەوەش بلێم : دوکتۆر کمال مظهر لە (کوردستان)ـەکەیدا لەپەراوێزی لاپەرە (٤٠) دا لەبارەی دەرچوونی گۆڤاری (بانگی‌کورد)ەوە دەڵێ :

«ژمارە یەکی ئەم گۆڤارە رۆژی (١٢)ی (ربیع الاول)ی ساڵی (١٣٣٢)ی
ك . واتە : (٨)ی شوباتی ساڵی (١٩١٤ . . . !) چاپکراوە . . . تاد»

کەچی ئەو نووسینەی کە عبدالعزیز بابان بەناوی بوژانەوەی کوردان‌و لەلاپەرە (١٠–١١)ی گۆڤاری (هەتاوی کورد)و بەبۆنەی دەرچوونی (بانگی‌کورد)و لەژمارە (٣)ی ئەو گۆڤارەدا – هەتاوی کورد – کە رێککەوتی (١٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩١٣)یە . بلأوی کردۆتەوە ، تا رادەیەکی باش لەگەڵ ئەم تۆمارەی دوکتۆر یەك‌ناگرێ‌و (چەندمانگێ) بەینیانە ، چونکە گەر (دەنگی‌کورد) لە شوباتی ساڵی (١٩١٤)دا ، دەرچووبێ ، چۆن دەکرێ خاوەنی (هەتاوی کورد) لەکانوونی یەکەمی ساڵی (١٩١٣)دا ، جاری دەرچوونی ئەو گۆڤارە بدات . . ! هەویرێکەو . . . . ! ؟

## سوپاس‌و سەرنج

- سوپاسی مامۆستاو ئەدیبانی بەئەدەب (حەمەبۆر –عبدالرحمن مزوری – احمد تاقانه) کە هەریەکەو بەجۆرێ هاریکاریان کردم .
- هەموو دەقەکانم بەرێنووسی ئەمرۆی کوردی نووسی‌یەوە .

# ئاشــــی ئـــــاو

● مولود قادر بێخاڵی ●

بەدووری نازانم کە گەلێك لە لاوو هەرزەکارانی شارەکانی ناوچەی کوردستان ئاشی ئاویان نەدیبێ‌و . نەش زانن چۆن بووەو . چ ئەرکێکی بەسەرەوە بووەو . چ سوودێکی بە ئادەمیزاد گەیاندووەو . چۆن خاوەن خیزانەکانی شڵەژاندووەو ماندووی کردوون تا گەیشتونەتە مەرامی خۆیان کە باراش هارین‌بووە ، واتە دەغل‌و دانیان کردۆتە ئارد . هەروەها دیسان بەدووری نازانم کە زوربەمان باسی ئاشی ئاوو ئەرك‌و ماندووبوونی باراش هارینمان لە باوك‌و باپیرانمان وەبەرگوێ نەکەوتبێ . لە هەمان کات‌دا لەو باوەڕەدام کە لە نێو خوێندەوارو ڕۆشنبیرانمان‌دا کەسانێ‌وا هەن هەر لەزووەوە بەشداری ئێش‌و ئازارو چەرمەسەری باراش لێ‌کردن بووبن‌و ، بەڵکو لەوەش زیاتر جاری وا بۆ چەند ڕۆژێك بەدیار باراشەکەیانەوە شەوو ڕۆژیان بەیەك گەیاندووە تاوەکو نۆرەیان گەیبێتێ .

## ● ئاشی ئاوو ئەرکەکانی ●

بە پێی ئەو بۆچوونەی سەرەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە لە ساڵانی ڕابردوودا . بەر لە پەیدابوونی ئاشی ئاگر لە زوربەی دێهات‌و ناوچەکانی کوردستان‌دا . ئاشی ئاو هەبووبێ . ئێستاش گەڕیەکێ بیەوێ بەووردی لەم هەقیقەتە بکۆڵێتەوە . ئەوە لە زوربەی شارو دێهاتەکان‌دا بێ‌سێ‌و دوو پاشماوەی کاولە

ئاشەکان راستی‌یەکی بەڵگە نەویستن ، تەنانەت لە هەندێ شوێن‌دا شوێنەوارەکان زۆر بەئاشکرا خۆیان دەنوێنن ، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخا کە ئەو جۆرە ئاشانە لە زۆر ناوچەو شارو دیهاتەکان‌دا باویان بووە ، هۆی بوون‌و نەبوونیشی لە ناوچەیەکەوە بۆ ئەوی‌ترو ، لەدێیەکەوە بۆ دێیەکی‌دی بەندبووە بە بوون‌و نەبوونی ئاوەوە ، جا ئەگەر لە ناوچەیەك‌دا رووبار یا کارێزێکی ئاو نەبوابە ، ئەوە بۆیان نەدەکرا ئاشی لێ دابنێن ، چونکە ئاشەکە پێویستی بە جۆگە ئاوێکی باش بووە . کە تایبەت بێ بەئاشەکەوە . هەربۆیەشە کە ئێستا کانی‌یەکیان وەبەرچاو دەکەوێ گورج دەڵێن : «ماشەڵلا ئاشگێرێك ئاوی لەبەر دەروات» ، جا بۆ ئەوەی ئاشەکە هەر لەگەڕ بوایە ، ئەوە دەبوو بەردەوام ئاوی بەسەرەوە بێت‌و ماوەی هیچ کەسێ نەدەدرا ئاوەکە بگرێتەوەو ، دەسکاری ئەو جۆگە ئاوە بکات کە بەتایبەت بۆ ئاشەکە هەڵ بەسترابوو . بەزۆریش جۆگە ئاوەکە لە شوێنێکی دوورەوە هەڵ‌ئەگیراو بەرێك‌و پێکی بەرەو ئاشەکە دەهات تا دەگەیشتە سەر قۆتەرەی ئاشەکە . ئیتر زۆر جا رکەم بوونەوەی ئاوەکە دەبووە هۆی ئەوەی ئاشەکە لەکار بوەستێ ، هەر بۆیە دەبوو جۆگاکە زوو زوو بەسەر بکرایەتەوە نەوەك بەلایەك‌دا بشکایەو کەلەبەرێکی تێ‌بکەوتایە . وە ئەگەر ئەم گرفتە نەهاتایە پێشەوە ، ئەوە هەفتەی جارێ جۆگاکە هەر لە سەر قۆتەرەکەیەوە تاوەکو بنەوانی ئاوەکە بەسەرەدەکرایەوەو جۆماڵ دەکراو هەر پووش‌و پەلاشێکی لە نێو جۆگاکە هەبوایە لادەبراو پاك دەکرایەوەو ، سەرپشت‌و لێواری جۆگاکەیش بە پشتە بێڵ دەپەسترایەوە تا توندو تۆڵ بێت‌و مەترسی ئاو دزینی لێ‌نەکرێ ، ئیتر لە هەر شوێنێ هەست بە تەرایەتی ئاوبکرایە دەست‌بەجێ چارەسەری دەکرا ، چونکە لەبەر ئاوزۆری‌و تەوژمی‌یەوە مەترسی ئەوەیان لێ‌دەکرد جۆگاکە بشکێت‌و ئاشەکە بوەستێت ، ئەڵبەتە ئەو وەستانەیش چەند زیانی بۆ خاوەن ئاش‌و ئاشەوان دەبوو ، دە هێندەیش ماندووبوونی بۆ دانیشتوانی دێهاتەکانی دەورو بەری ئاشەکە دەبوو ، چونکە دەبوو بەرەو دێیەکی‌تر بکەونە رێو ، رێگایەکی دوورو درێژ ببرن تاوەکو دەگەیشتنە ئاشێکی دیکەو . تا نۆرەیان وەبەر دەکەوت ماوەیەکی زۆری دەخایاند .

## ● قۆتەرەی ئاو چۆن هەڵ دەبەسترێ ●

دوو جۆر هەڵبەستنی قۆتەرەی ئاشی ئاو هەیە : جۆری یەکەمیان ، لە پێ دەشت دروست دەکرا . پێ‌یان دەگوت ئاشی بەتەنوورە . ئەم جۆرە ئاشە دەبوایە خانووەکەی لە شوێنێکی نزمدا دروست بکرێت‌و بەرزایی‌یەکی چاکیش بۆ قۆتەرەکەی رێك خەن‌و جۆگە بۆ پەری تەمۆ لە قۆتەرەوە لە سەرشکڵی تەنور – تەندور – بە بەردو گەچ هەڵیان دینا . «دروستیان دەکرد» . لە سەری قۆتەرەوە بە بەرینی دەستی پێ‌دەکردو ووردە ووردە تەسك دەکرایەوە تا دەگەیشتە ئاستی پەرەکانی تەموو بۆ ئەوەی بە تەوژم لە پەرەکانی تەموو بدات . ئەمەش ئەگەر ئاوی ناوچەکە کەم بوایە ، ئەم جۆرە گەلێ جار زیانی زۆری بە ئاش دەگەیاند . چونکە کونی تەنوورەکە لە ئاستی پەرەکانی «تەمو» گەلێ جار کیسەڵێکی گەورە یا مەرو ماڵات‌و پەرەوولی مرداری تێ‌دەکەوت ئیتر کونەکەی دەگرت‌و ئاوەکە دەپنگایەوەو بەناو ئاشەکە وەردەبوو . ئاشەکە دەوەستاو زوربەی باراشەکانیش تەردەبوون‌و دەوروبەری بەرداش‌و خوانەیش پڕ لە لیتراو دەبوو . ئەم کارەیش ماوەیەکی زۆری دەویست تاووشك دەکرایەوەو پاك دەکرایەوە .

جۆری دووەمیشیان : لە ناوچە شاخاوی‌یەکان دروست دەکراو پێ‌ی دەگوترا ئاشی بەکۆل ، کۆلی ئاشیش بریتی‌بوو لە دارێکی هەشت تا نۆ گەز درێژ بە زۆریش ئەو دارە یا داری «توو»بوو یا داری «بی» ، چونکە ئەم دوو جۆرە دارە ماوەیەکی

زۆر له نێو ئاودا نه‌ده‌رزی ، ئیتر ناوه‌که‌ی هه‌ڵ ده‌کۆڵدراو لایه‌کیان هه‌ڵ ده‌گرت له سه‌ر شکڵی جۆگا له قۆته‌ره‌وه سه‌ره‌ولێژ ده‌هاته خواره‌وه‌و له ئه‌ندازه‌ی په‌ره‌کانی ته‌مو پلوسکه‌کی بۆ دروست ده‌کرا ، ئه‌ویش هه‌ر بۆ ئه‌وه‌بوو تا ئاوه‌که‌ی کۆل به‌تین‌و ته‌ووژم بیدایه له په‌ره‌کانی ته‌موو بی‌سوراندایه‌و ئاشه‌که‌ی وه‌گه‌ر بخستایه . خۆ ئه‌و جۆره‌ش وه‌نه‌بێ زیانی نه‌بووبێ ، به‌ڵکو زۆر جار که‌لێنێکی تێ ده‌که‌وت‌و ئاو ده‌رژایه نێو ئاش‌و هه‌مان زیانی جۆری یه‌که‌می به ئاش‌و ئه‌نووره‌ی ئاش ده‌گه‌یاندو باراشه‌کانی به‌رباد ده‌کرد ، بۆیه ده‌بوایه به گورجی ئاو له سه‌ر ئاشه‌که ببڕن ، ته‌خته‌یه‌کی تازه له که‌له‌نه‌که بده‌ن ، به‌ڵام ئه‌م جۆره ئاشه‌یش ، واته – ئاشی به‌کۆل – ده‌مێکه له ته‌خته‌به‌ند ڕزگاری بووه‌و به چیمه‌نتۆ هه‌ڵی دێنن . بۆیه ده‌توانم بڵێم کاره‌ساته‌که‌ی سه‌ره‌وه‌ی وه‌ك جاران نه‌ماوه ، پێشتر باسی جۆگاو قۆته‌ره‌و کۆڵمان کرد ، خۆ ده‌بێ ئه‌وه‌ش بزانین ئاو دوای به‌کار خستنی ته‌موو کاره‌ساتی شکانی به کوێدا ده‌چێت‌و ئه‌و شوێنه‌یش چی‌پێ ده‌گوترێ زه‌ندۆر .

## ● ئاشی ئاو چۆنه‌و له‌چی پێك دێ ●

ئاشی ئاو به هه‌ردوو جۆری ده‌بێ خانووه‌که‌ی وادروست بکرێ لای به‌رداش‌و ئامێره‌کانی ترێ دووقات بێ چونکه که‌ل‌و په‌ل‌و ئامێرێکی زۆری ده‌که‌وێته ژێرو ، هه‌ندێکیشیان هه‌ر ده‌بێ له نێو ئاوبن ، ئاوه‌که‌ش ده‌بێ له سه‌ره‌وه به‌ره‌و خوار ، واته له قوته‌ره‌وه بۆ بیر یا به‌رمیل به هه‌موو تین‌و ته‌ووژمێکیه‌وه بێته خواره‌وه بۆ پلۆسکه ، یابوسکه که لێیه‌وه نزیکه‌و ، ئاو به هه‌موو تین‌و ته‌ووژمه‌وه به په‌ره‌کانی ته‌مو ده‌که‌وێ‌و «ته‌مو»ش له

ژێره‌وه به هۆی په‌ره‌کانی‌و ئاوی قۆته‌ر ده‌ست به سوران ده‌کا به یارمه‌تی بستو ته‌وه‌ر ، به‌رداشی سه‌ره‌وه ده‌خاته گه‌ر بست‌لوله ئاسنێکی خرپله‌ی پته‌وه به درێژایی مه‌ترو نیوێ زیاتر یا که‌متره ، سه‌رێکی له ژێره‌وه له نێو ئاوه‌و له ناوه‌ڕاستی ته‌مو به‌ند ده‌کرێت‌و به هیچ جۆرێ نابێ جوڵه بکات ، سه‌ره‌که‌ی تریشی له ناوه‌ڕاستی به‌رداشی ژێره‌وه که له نێو خوانه‌ی ئاشی گیراوه به خری‌ی دێته ده‌ره‌وه تا ده‌گاته سه‌ر گه‌رووی به‌رداشی سه‌ره‌وه ، ئه‌وسا به هۆی ته‌وه‌ر بست له سه‌ر پشتی به‌رداشی سه‌ره‌وه به‌ند ده‌کرێت ، به‌م جۆره به‌رداشی سه‌ره‌وه ده‌که‌وێته سه‌رووی به‌رداشی ژێره‌وه ، ته‌وه‌ریش پارچه ئاسنێکه به پانایی سێ په‌نجه‌و درێژایی دوو بست‌و ئه‌ستورایی په‌نجه‌یه‌ك . به‌رداشی سه‌ره‌وه ده‌خاته گه‌ر ئه‌وجا که به‌رداشی سه‌ره‌وه وه‌گه‌ر که‌وت دانه‌وێڵه له دۆڵه دانه‌وه دێته نێو سورێنك‌و . له سورێنکه‌وه‌ش ده‌چێته نێو گه‌رووی به‌رداش به هۆی بڵندو نزم‌بوونی چه‌قه‌نه . چونکه چه‌قه‌نه سه‌رێکی ده‌که‌وێته سه‌ر کونی گه‌رووی به‌رداشی سه‌ره‌وه له گه‌ڵ سوران‌و گه‌ڕانی به‌رداشه‌که ده‌نك ده‌نك دانه‌وێڵه ده‌خاته نێو گه‌رووی به‌رداش‌و ده‌یهاڕێ‌و ده‌بێت به ئارد .

**ته‌مو :**

له په‌روانه‌ی پانکه‌ی ئوتومبێل ده‌کات ، وه ئه‌گه‌ر په‌ری پێوه نه‌بێت له شکڵی به‌رمیلی بچووك ده‌کات ، به‌ڵام له هه‌موو لایه‌که‌وه په‌ری پێوه‌یه ، ته‌مو ده‌بێ له داری‌توو دروست بکرێ چونکه داری‌توو له داره‌کانی‌تر زیاتر توانای خۆگرتنی هه‌یه‌و . له نێو ئاودا به ئاسانی نارزێ ، په‌ره‌کان له‌سه‌ر شێوه‌ی که‌وچکی په‌ل دروست ده‌کرێن ، به‌ڵام داری ئه‌و په‌رانه به پێچه‌وانه‌ی داری ته‌مویه ، له داری بی نه‌بێ له دارێکی دی دروست ناکرێ ، جا ئاو به هه‌موو تین‌و ته‌ووژمیه‌وه له پلوسکه‌وه به په‌ره‌کانی ته‌مو ده‌که‌وێ‌و په‌ر به دوای په‌ر ته‌مو ده‌سورێنێ . ئیتر هه‌رکه ته‌موو وه‌گه‌ر که‌وت بست ده‌که‌وێته سوڕو به‌رداشی سه‌ره‌وه ده‌خاته گه‌ڕو سوڕان ، به‌رداشی سه‌ره‌وه به زۆری له

سێ پارچە بەردی یەك ئەندازەیی پێك دێ‌و بە – تۆقێك «پژدێنێکی» ئاسنی لە یەك گیر دەکرێن تا بە سووك‌و هاسانی بتوانن هەڵگێرو وەرگێری بکەن لە کاتی بیراز کردن‌دا . چونکە لە کاتی بیراز کردن‌دا تۆقەکەی سەرەوە بە ئەسپایی دەترازێن‌و پارچە پارچە بەرداشەکە دێننە خوارەوەو بیرازی دەکەن . هەر کە بەرداشی سەرەوە خرایە سەرووی بەرداشی ژێرەوە کە جێ‌نیشەو نابێ جوڵە بکات . تەنانەت جار جار نەبێ ئەویش بە هۆی دار خوانەوە . کە دارێکە لە سێ تا چوار مەتر درێژەو چوار گرێ ئەستوورە ، لە سەر رووی زەوی لە ژێر بەرداشی بنەوە داندراوە ، لە سەرێکی تریشەوە سەری پێ ئاشی خراوەتە ژێر ، ئەو سەرەش دەبێ نەختێ هەڵ‌کەنن ، بە قولاپی قولانجێك تا بتوانن سەری هەنجاری تێدا بەند کەن بۆ ئەوەی هەرکاتێ پێویست بێ بتوانن گەرانی ئاشی پێ سووك یا گران بکەن . بۆ ئەوەی ئاردەکە ووردبێ یان نەختێ درشت . یاگەنم بکەن بە بروێش . دارێکی تریش هەیە پێ‌ی دەڵێن – مرخە – ئەویش یا لە داری تو وەیا لە داری بی دروست دەکرێ بە درێژایی مەترێك زیاترو ، بە ئەستورایی چوار گرێ . هەرکاتێ ئەو مرخەیە بدەنە بن پێ‌ی ئاش ئیتر چۆنیان ئارەزووبێ باراشەکە زا لێ دەکەن . وورد . زبر . درشت . زۆر وورد . هەروەها بۆ بروێشیش بەکاری دەهێنن . ناوی مرخەش لە کوردەواری زۆر باوە تاوەکو گەلێ‌جار مرۆڤێ گەر نەختێ گران‌بێ – واتە تەمبەل‌بێ – دەڵێن هێندە گرانە مرخەشی بدەنە ژێر جوڵە ناکات . جاری واش دەبێ ئاشەوان رقی لە باراش هاربێ هەڵ‌دەگرێ ئیتر پێ ئاشەکە بە دزی سووك دەکات‌و نیوەی باراشەکە دەرژێنێتە نێو ئاوو لە ژێرەوە بەفیڕۆ دەڕوات .

**ئاشەوان :**

ئەو بۆ چوونەی سەرەوە ئەوەمان بۆ دەردەخا کە ئاشەوان دەبێ گەلێ ووریابێ‌و ئاگاداری جۆگەی ئاش بکات سەرەڕای ئەو ئەرکەی کە لە نێو ئاشدا پێویستە ئەنجامی بدات .

ئاشەوانی کڵۆڵ هەردەم تاسەر ئەژنۆ قاچەکانی هەڵ‌ماڵیوەو ، سەرو سمێڵ‌و ریشیشی وەك بەفریان بەسەردا باریبێ وان ، برۆو برژانگی چاوەکانیشی لە گەردی ئارد گیراوون . مرۆڤ ئەگەر ئاشەوانی نەدیبێ‌و بە تاریکی رووبکاتە ئاش‌و لە پرێکدا چاوی بە ئاشەوان بکەوێ سەرسام دەبێ‌و ئەژنۆکانی دەکەونە لەرزین لە ترسی دیمەنی ئەندام‌و ئاکاری سەرو چاوی ئاشەوان . چونکە لە مێردەزمە نەبێ لە چیتر ناکا . خۆ ئەوەی مووە لە باڵۆڵەی باسکی‌و دەم‌و چاوو سەری‌یەو بارستێ ئاردی لێ نیشتووە . تەنها کونی چاوەکانی نەبێ کە بزەبز دەکەن وەك ئەوەی رووناکایی لە کەلەنە دیوارێکەوە دەربکەوێت وایە . لێویشی هەروەك هێڵێکی ئاڵی باریك نیشان دەدات . جمە شرو پرەکانیشی لە تۆزو گەردی ئارد رزگاریان نابێت . کونی هەمو سەرە تەقەڵێکی سەر بەرگی یاکورتەکی یا هەر سەرە بەرگێکی تربێت وەك چاوی مێرو خۆی نیشان دەدات لەبەر بارستایی تۆزی ئاردو ئارەقەی ماندووبوون .

ئاشەوان شەوو رۆژ وەستانی نی‌یە . گەلێ جاری وادەبێ ژن‌و منداڵەکانیشی تووشی هەمان تەنگ‌و چەڵەمەی ئاش دەبن ، خۆ لە لیدانیش بێ‌بەش نابن . ئەو هەموو ماندوو بوونەی ئاشەوان هەر بە نان‌و سلك ئەنجام دەدرێ‌و پارووی چەوریش بۆ خاوەن ئاشەکەیە ، کە لە دوورو نیزیك نازانێ ئەرکی ئاش چی‌یە .

**چوونە ئاش :**

چوونە ئاش ساڵانی زووکارێکی بەردەوامی خاوەن ماڵ‌بوو بۆ باراش هارین ، ئەڵبەتە ئەوەشیان لەبیرە کە ئاش بە نۆرەبوو . تەنها بۆ ئافرەت‌و نەخۆش نەبێ کە ماوەیان دەدرا نۆرە برییان بۆ بکرێت ، لە گەڵ ئەوەش‌دا چوونە ئاش بۆ باراش هارین گەلێ هاسان نەبوو ، بەڵکو دەبوایە ئەو کەسەی دەچێتە ئاش ماوەیەکی باشی هەورازو نشێوی ببڕیایەو . قوڕو چڵپاوێکی زۆری بشێلایە تا دەگەیشتە ئاش . لەتەك ئەمانەیشدا زۆر جار لەرێگا تووشی گەلێ ئاڵۆزی دەبوو ، وەك بار لێ‌کەوتن‌و وولاخ کەوتن ، لەم دوو حاڵەتەدا باراش هار ئەرکێکی زۆری دەکێشا

ـ بارەکەی راست دەکردەوە . یا وولاٌخەکەی هەڵ
دەستاندەوە . گەلێ جاری وایش دەبوو هیچی بۆ نەدەکراو .
کتێکی زۆر چاوەڕوانی ڕێبوارێکی دەکرد بەڵکو یارمەتی
بدات . جاری وایش دەبوو هێندە چاوەڕوانی دەکرد تا هیوا
بڕدەبووو ترسی ئەوەشی لێ دەهات تاریکی‌ی بەسەردا بێت‌و
بێتە شەو . بۆیە ناچار دەبوو بارو وولاٌخەکە جێ بهێڵی‌و ڕوو
بکاتە نزیکترین دێ . یا ئاوەدانی تاوەکو چەند زەلامێك لەگەڵ
خۆیدا بێنی‌و یارمەتی بدەن . ئەو جێ هێشتنەی وولاٌخەکەیش
گەلێ جار ڕێگەی لە بەردەم گورگ‌و درندەکانی دیکە خۆش
دەکرد کە هێرە بە گۆشتی وولاٌخەکە بکەن . خۆ ئەگەر
وولاٌخەکەشی جێ نەهێشتبا دوور نەبوو باران باراشەکەی چەند
ڕۆژی دیکە لە هارین دوابخات . تاوەکو گەنمەکەی ووشك
دەبووەوە . کەسانی واش هەبوون هەر بە پشت – بەکۆڵ –
چەند ڕبە دەغڵێکیان بە هەمبانەو توورەگە دەبردە ئاش .

**● ئاش‌و ڕابواردنی شەوانی :**

لەبەر ئەوەی ڕێ نەدەدرا نۆرە بری بکرایە . بۆیە دەبوایە
باراشەکان یەك لە دوای یەکتری‌دا دابنرایە . ئەو نەریتە وای لە
لەباراش هێری کلۆڵ دەکرد لە شەوێ زیاتر لە ئاش بمینێتەوە .
بۆیە ناچار دەبوو خواردن بۆ خۆی ئامادە بکات .
خواردنەکەیش بە زۆری نان‌و قەسپ . وەیا نان‌و دۆشاو
کاکلە گوێزێك دەهات . ئیتر ئەمەیان بە پێی بارو گوزەرانی
خاوەن باراشەکە دەبوو . هەندێکیش چەند نووردووە نانێکی
لە گەڵ خۆیدا دەبرد . ئەوەی نانیشی نەبردایە ئەوە هەر لە
ئاشەکەدا چەند نانێکی دروست دەکردو بەو نانەیش دەگوترا
«خەروە» . کە بریتی بوو لە جۆرە ئەستورکێکی تایبەتی‌و زۆر
خۆش . جا ئەوانەی لە ئاش دەمانەوە گەر ئارەزووی نانی
گەرمیان بکردایە هەتا بلێ‌ی یەك‌و دوو ئاگرێکی باشیان
دەکردەوەو بەردێکی تایبەت بۆ خەروە لە هەموو ئاشێکدا هەبوو
نەختێك پان‌و درێژبوو . دەیان خستە سەر ئاگرەکە تاسوور
هەڵ‌دەگەڕا . لەولاشەوە لە نێو جامێکدا یا کۆتکێکی دار
چەند گۆلە ئاردێکیان دەکردە هەویرو دەیان شێلاو بە شلی
ڕوویان دەکردە سەر بەردە خەروەکە کە لە سەر ئاگر سوور
دەبووەوە . دوای ماوەیەکی کەم وەریان دەگێرایە دیوەکەی
تری . لە گەڵ هەڵ گێرانەوەکەدا ئەو ڕووەی لەسەر بەردەکە
برژابوو وەکو کولۆکی نیسان‌و دەنووکی کەوی لێ دەهات‌و
سوور هەڵ دەگەڕا . ئیتر مرۆڤ هەر حەزی دەکرد بیخوا .
باراش هێرەکانیش کە لە دەوروبەری ئاگرەکەو ئەستورکە
خەروەکەدا کۆ دەبوونەوە بە بێ پێ‌خۆرو گەرماوگەرم هێرەیان بە
خواردنی دەکرد . گەلێ جاریش لەگەڵ ئەو پێخۆرانەدا دەیان
خوارد کە لە پێشەوە باسمان کردن . چونکە ئەوسا هێشتا «چا»
هێندە باوی نەبووو . نەش گەیشتبووە هەموو لایەکی وولاٌت .
بەلاٌم لە گەڵ بلاٌوبوونەوەی شەکرو چا لە هەر ئاشێك‌دا تاقم‌و
تەدارەکی چا هەبوو ئەویش بەم جۆرەبوو . کتلیەکی قوڵپ
داری لوولە درێژی دووکەلاٌوی ڕەش . ئەمە وەنەبێ کە
ناوەوەیشی لە دەرەوەی خاوێن تر بووبێ . بەلاٌم لە گەڵ
ئەوەش‌دا چایان هەر تێدا لێ‌دەناو زۆریش بە تام‌و بۆ بووو لە
گەڵ نانی خەروە دەیان خواردەوە . شەوانیش لە دەوروبەری
کتلیە بۆرە کۆ دەبوونەوەو دیشلەمە دوای دیشلەمەیان هەڵ
دەقوراندو دەستیان بە گۆرانی‌و مەتەڵ گێرانەوەو حیکایەت
دەکرد . پەیتا پەیتاش باراشەکانیان دەماڵیەوە بەو ئامێرەی کە
پێ‌یان دەگوت بێرۆك‌و . بەم جۆرە شەوانی دووروو درێژیان
بەسەر دەبردو کارەکەی خۆیشیان بە بێن فراوانی‌یەوە مەیسەر
دەکردو بە دڵێکی پڕ لە هیواشەوە بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە .

**● بێرۆك :**

لە سەر شێوەی خاکەناز دروست دەکرا بەلاٌم بە پەلی‌و
دەسکیشی پێوە نەدەبوو . ئەم ئامێرە ئاردی لە نێو بەرۆك‌و پێ
کۆدەکرایەوەو بە یارمەتی گەسکەوە دەخرایە نێو جەواڵ یا ئەو
هەمبانەیەی کە باراش هێر لە گەڵ خۆی‌دا دەیبردە ئاش . ئیتر
دوای پاککردنەوەی بەرۆك . دووبارە باراشی تازەیان دەخستە
سەر کۆل – دۆرەدان –و دوای پێوانی باراشەکە بە کەپوولە بۆ

ئەوەی هەق ئاشی لێ بگێڕنەوە ، هەقەکەش یانزەیەك بوو ، واتە هەر دە کەپوولە بخرایاتە سەر کۆل – دورەدان – یانزە هەم بۆ خاوەن ئاش بوو ، ئەڵبەتە مەسەلە نۆرە بڕیش بۆ ئافرەت لە هەموو ناوچەیەکدا کارێکی زۆر ئاسایی بووو ، بەردەوامیش ڕێز لە ئافرەت دەگیراو یارمەتی دەدرا .

● **ئەو ئامێرو کەلو پەلانەی لە ئاشی ئاودا بەکار دەهێنران :**

● کول : ئەو شوێنەیە کە دانەوێڵەی تێ دەکرا بۆ هارین و لە ناوەراستی بەشی خوارەوەی کونێکی تێ دەکراو بە سەرێکی بوسکە دەبەسترایەوە .

● بوسکە : لە قامیشی کلۆر دروست دەکراو سەرێکی لە ناوەڕاستی کۆل گیر دەکرا تاوەکو دانەوێڵەی پیَدا بچێتە خوارەوە بۆ نێو سورێنك .

● سورێنك :

سەری بوسکە دەکەوێتە نێو سورێنك ، چونکە سورێنك وەك کۆل وایە ، بەلام ئەمیان لە سەرەوە والایەو ، لە تەنیشتەوە چەقێنەی پێوە قایم کراوە ، سەرێکی دەکەوێتە سەر بەرداش و لە گەڵ سوڕانی دا بڵندو نەوی دەبێت و ، دانەوێڵە لە سورێنکە دەخاتە نێو گەرووی بەرداشی سەرەوە .

● چەقێنە : بە عەیار دانەوێڵە – بە مانای دەنك دەنك ، وەك ڕێچکەی مێرووله لە سورێنکەوە دەبات بۆ گەرووی بەرداشی سەرەوە ، لەوێشەوە دانەوێڵەکە دەکەوێتە نێوان هەردوو بەرداش و دەبێت بە ئارد .

● تۆق : پارچە ئاسنێکی تەنکە لە نێو قەدی بەرداشی سەرەوە دەبەسترێت ، چونکە ئەو تاکە بەرداشە دەبێ سێ پارچەی ڕێکو پێك بێت تاکو بە هاسانی هەڵگێرو وەرگێری پێ بکرێت .

● تەوەر : پارچە ئاسنێکی دوو بست درێژەو ئەستورایی‌یەکەی بە قەد پشتی پەنجەیەك دەبێ و لە سەر بەردی سەرەوە جێگەی بۆ خۆش دەکرێ ، ناوەراستەکەی کونە تا بست بەند بکات ، ئیتر ئەوسا بست بە هۆی تەوەر بەرداشی سەرەوە دەسوڕێنێ ، چونکە بەرداشی ژێرەوە لە نێو خوانەو ، لەسەر زەوی چەسپێندراوەو نابێ جولە بکات .

● بست :

ئاسنێکی لولەیی خرە ، لە تەمو قایم دەکرێ و سەرێکی لە نێو بەردی گەورەیەو ، لە بن ئاشی بە نێو بەرداشی ژێرەوەدا دەکشێت بۆ نێو بەرداشی سەرەوە لە سەر گەرووی بەرداشی سەرەوە بە تەوەر قایم دەکرێ تا بەرداشی سەرەوە لە گەران نەبێت .

● بەرۆکی ئاش :

لە شێوەی ئاخوری وولاخ دەکات ، ئاردداوای هارین لەنیوبەروك کۆدە کرێتەوە .

● پشتوك :–

ئەو ئاردەی دەکەوێتە نێو پشبرۆك ، گەلێ تۆزی لێ دەنیشێ ، بۆیە هەرتەنها بۆ مەروو مالات بەکاری دێنن چونکە کەلکی نانی نی‌یە ، ئەویش هەر بۆ ئاشەوانە .

● بێرۆك :

«واتە بێڵێکی بچوك» ، ئەمەیش لە دار دروست دەکراو لە سەر شێوەی خاکە نازێکی بچوك وایەو دەسکی پێوە نی‌یەو ، ئاردی ناو «بەرۆك»ی پیَ تیَدەکەنە نێو جەواڵ و هەمبانەو کەرەستەی دیکە کە بۆ باراشیان دەبردە ئاش .

● کە پوولە یا قەپوولە :

عەیاری ئاشە ، دانەوێڵەی باراشی پیَ **دەپێورا** «١١» یازدە کەپوولە بۆ باراش هێربوو ، کە پوولەیەکی بۆ ئاشەوان ، بەو کەپوولەی ئاشەوان دەگوترێت مزەی ئاش ، ئەو مزەیەش وانەبێ هەر یانزەیەك بێ ، بەڵکو بە گوێرەی گرانی و هەرزانی‌ی دەغلو دان مزە وەردەگیرا .

● بیراز :

یا بیراستن ، یا دەمە زەردکردنەوە : لەبەر ئەوەی ڕووی بەرداشی سەرەو لەسەر ڕووی بەرداشی ژێرەوە دەسوڕێ بۆ

هارێنی دانەوێڵە تا بیکاتە ئارد. ئیتر ئەو لێك سوورانە - خشانە - دەبووە هۆی ئەوەی کە ڕووی هەردوو بەرداشەکە، واتە هی سەرەوەو هی ژێرەوە لووسو ساف بن لە جیاتی ووردکردنی دانەوێڵەو کردنی بە ئارد، دەی جویو فڕیّی دەدایە دەرەوەو بە کەڵکی نان نەدەهات. بۆیە زوو زوو دەبوایە هەردوو بەرداشەکە بیراز بکرانایەتەوە. ئەو ماوەیەش لە نێوان ١٥ ڕۆژو مانگێکدا دەبوو. گەلێ جاریش زۆریو کەمی کارکردنی ئاشەکە سنووری بۆ ماوەکە دادەنا. بۆ ئەم کارەیش ئاش وەستای تایبەتی هەبوونو. ئەوان لەم بوارەدا شارەزاو پسپۆربوونو کەرەستەی تایبەتییان هەبوو لەم کارەدا بەکاریان دەهێناو بە چاکی دەیان پاراستن.

بۆ بیرازکردنەوەیش دەبوایە یەکەم هەنگاو ئاوەکەی ئاش ببڕنو بەلایەکدا بیشکێنن. دوای ئەوە بەرداشی سەرەوە بەرز دەکرایەوەو دەخرایە سەر لایەکو پشتی بەرداشە بەرزکراوەکە دەدرایە دیواری دورەدانکۆل. ئەوسا ئاش وەستاکە لە سەر ڕووی بەرداشی ژێرەوە چۆکی دەدایەوەو بە ووردی بە «سومبە»و چەکوش دەکەوتە گیانی بەردەئاشەکە تا بە تەواوەتی هەرچی سافیو لووسی بەردە ئاشەکە هەبوو گرێ گرێو گرنج گرنج دەبووەوە - واتە تیژ دەبووەوە - ئینجا بە هەمان شێواز بەردەکەی سەرەوەیشی بیراز دەکردەوەو پاشان دەخرایەوە شوێنی خۆیو، ئاشەکە بەگەڕ دەخرایەوەو. ئیتر ئاردێکی وورد بێ عەیب لە مابەینی هەردوو بەردەکەدا دەهاتە خوارەوە، جگە لەم کارەیش، هەر ئەو ئاش وەستایانە هەر گرفتێکی لە ئاشدا بهاتایەتە پێشەوە، ئەوان جێبەجێیان دەکردو ڕێکیان دەخستەوە.

پێشتر گوتمان ئاش بە نۆرەبوو، ئەو نۆرەیەش گەلێ جار بۆتە هۆی کارەساتو شەڕی ناخۆش لە ئاشو لە نێو باراش هێرەکاندا، جاری وایشبووە لە نێوان ئاشەوانو ژنەکەییو. باراش هێرەکان کێشەو دەمەقاڵێ دروستبووە، نۆرەش ئەوەبوو هەرکەسێك نۆرەی بگەیشتایە گورج باراشەکەی خۆی دەخستەسەر کۆلی ئاشو ئیتر بە خۆی دەهاتە خوارەوەو لە نزیکی بەرداشەکە بێرۆکە - بێڵەکە -ی بەدەستەوە دەگرتو ناوە ناوە بە بێرۆکەکە ئاردەکەی لەبەر لێواری بەردەئاشەکە کۆدەکردەوەو دەیدایەدواوە بۆ ئەوەی ڕێگای لە بەردەم ئاردی تر بکردایەتەوەو جێگەی بۆ خۆش دەکرد، جا بۆ ئەوەی بیزانیایە ئاردەکە وورده یا درشتە -زبرە- گۆلێکی لە ئاردەکە دەداو هەڵی دەگرتو بە توندی مستی دەداو هەڵی دەگرتو بە توندیٔ مستی خۆی دەنووقاندو. ئیتر گەر ئاردەکە وورد بوایە دەچووە پاڵ یەكو وەکو کلۆی لێ پاڵ یەكو وەکو کلۆی لێ دەهات، ئەگەر وایش نەبوایە ئەو دیاربوو ئاردەکە درشتو زبر بوو، خاوەن باراشەکە بە پەلە دەچوو ملی ئاشەوانی دەگرت تا وابکات ئاردەکەی وورد بێت. ئەو کاتە ئاشەوانەکە دەچوو مرخەیەکی لە هەنجار دەداو پیی ئاشەکەی گرانتر دەکرد بۆ ئەوەی تەمو چاکتر بسوڕێو خولی بەرداشەکەیش زیاتر بێ تاوەکو ئاردەکە ووردتر بێت. دووبارە دەگەڕایەوە لای بەرداشەکەو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە ئاردەکە زۆر دەبووو. بەری بەرداشەکەی دەگرت جەواڵ بوایە یا هەر کەلو پەلێکی تری پێبوایە دەیهێنایە پێشەوەو ئاردەکەی تێ دەکرد.

ئەوانەی هاتو چۆی ئاشیان دەکرد دەگێڕنەوەو دەڵێن: لەو کاتەی مرۆڤ لە نێوان بەروك چاوەڕوانی ئارد ماڵینەوەی دەکرد خەوێکی زۆری بە سەردا دەهاتو جاری واهەبوو بە ناچاری سەرخەوێکی دەشکاند..

### ● ئاشەوانو دیاریی ●

گومان لەوەدا نییە کە ئاشیش وەکو هەر دەزگایەکی تری بازرگانیو خزمەتگوزاری کەوتۆتە بەرڕکێی گەرمیو ساردی ژیانو گوزەرانو بوونو نەبوونو باری دابیو گەشە کردووو پڕ لە نەهامەتی خەڵکی ناوچە جیا جیاکانی وولاتو. هاتو نەهاتی کشتوکاڵو دەغڵو دانو دانەوێڵە. ئیتر لەو ساڵانەی کشتو کاڵ هات بوایە ئەوە خەڵکی ناوچەکەیش باری گوزەرانیان خۆش دەبووو. فەرامۆشیان وەبەردا دەهاتەوەو.

شتێکی زۆر ئاسایش بوو کە مەسەلەی بوژانەوەی باری دارایی خەڵکە کاری بکردایەتە سەر دەورو بەرو کارو کەرەستەکانی بەرهەمو خزمەتگوزاری ، ئەڵبەتە ئاشیش یەکێك بوو لەو کەرەستە خزمەت گوزاری‌یانەی وەبەر ئەو کارتێکردنە دەکەوت ، جا ئەوساڵەی وەرز چاك بوایەو هات بوایە ئاش بە هەرمێن دەکەوتو ئاشەوان کاری زۆر چاك دەبوو تەنانەت ڕۆژگاری وادەبوو بەلا لووتیش وەڵامی ئەو کەسانەی نەدەدایەوە کە باراشیان دەبردە ئاش . جاری وایش دەبووە جۆرەها کلکە کوتەی دەکرد هەر بۆ ئەوەی باراش هێڕ رووی تێ‌بکاو باراشەکە بەرێتە ئاشەکەی ئەوو ، بەرەو ئاشێکی‌تر نەچێ ، جا ئەو مەسەلەیە وا دەکەوتەوە کە ئاش بە هەرمێن بوایە خاوەن باراش ناچار دەبوو کۆمەڵێك دەستو دیاری لەگەڵ خۆیدا بەرێ بۆ ئاشەوانو هەتا ژنو منداڵەکانیشی ، چونکە ترسی ئەوەی لێ دەهات کە باراشەکەی دوا بکەوێ‌و بۆ چەند ڕۆژێك لە ماڵەوە دوور بکەوێتەوەو سەرماو سۆڵەی زستانیش لەوێ بوەستێ . ئیتر گەلێ جار دیاری پیاوان — واتەخاوەن باراشەکان بۆ ئاشەوان بریتی دەبوو لە خواردن بەلام دیاری ژنە باراش هێڕەکان بۆ ژنی ئاشەوان بریتی دەبوو لە کلو کلدانو مێخەكو ملوانکەو دەسماڵو ئاوێنەی بچووکی نێو باخەڵو کەرەستەی لەم بابەتە ، جا ئەوانەی ئەم جۆرە دیاری‌یەیان ببردایە بۆ ئاشەوانو ژنەکەی ، ئەوە هەم جێگایان خۆش دەبووو خواردنی چاکیان دەدرایەو ، هەم نۆرە بریشیان بۆ دەکراو وەپیش کەسانی دیکە دەکەوتن‌و ، ئاشەوانو ژنەکەیشی مامڵەتی چاکیان لەگەڵ‌دا دەکردن ، ئەڵبەتە ئەو کەسانەیش خۆیان بە بەختەوەر دەزانی .

لەلایەکی دیکەشەوە هەندێ لە خاوەن باراشەکان مەترسی ئەوەیان هەبوو ئاشەوان دزی‌یان لێ‌بکات ، ئیتر وەکو گوتمان دەستو دیاری‌یان بۆ دەبردو میچکە میچکیان لە بەردەم ئاشەوانەکە دەکرد بۆ ئەوەی دزی‌یان لێ‌نەکات . بەلام شتێ هەبوو ئاشەوان گەر دز بوایە یا دز نەبوایە ناوی هەر بە دز دەرچووبوو ، هەر بۆیەش دەڵێن :

«یەکێ ساڵێ ئاشەوانی بکات ، دەبێ حەوت ساڵ مجیووری مزگەوت بێ تاوەکو خوا لە گوناحەکانی خۆش بێ» .

بەلام گەر ئاش بە هەرمێن نەبوایە . واتە ئاشەوان بازاری نەبوایە ، ئەوە بە پێچەوانەی پێشوو کەشای بە سەپانی خۆی نەدەزانی ، ئەمجارەیان لاتو مەلوولو کز دەهاتە بەرچاوو ، تەنانەت جاری وا دەبوو دوور بە دوور بەرەو پیری باراش هێڕەکان‌دا دەچووو کلکە کوتەی لە بەردەم‌دا دەکردنو ، بە گەرمو گوری پێشوازیی دەکردن تەنانەت ئەو ڕۆژانەی ئاشیش بە تاڵ دەبووو ، ئاشەوان بێ‌کار دەمایەوەو باراشی لێ دەبرا ، دەچووە سەربانی ئاشو بە دەنگێکی بەرزەوە بانگی دەکردو دەیگوت : «ئاش بەتاڵ . . ئاش بەتاڵ ، خەڵکینە زووکەن وەرن . . میوانی من بەسەر سەرن» .

بەم بانگەوازە خەڵکی دێ‌کەی ووریا دەکردەوە ، جا ئەگەر یەکێك باراشی هەبوایە ئەوە ئەو بێ دەسەلاتی‌یەی ئاشەوانی بە هەل دەزانی‌و خێرا باراشەکەی دەبردو دەیهاری . .

● **هێرش بردنە سەر ئاش** :

لە کاتی خۆیدا زۆر بە هاسانی هێرش دەبردرایە سەر ئاش . ئەویش لە لایەن ڕێگرو پیاو خراپانی ئەو زەمان . بۆ تالان کردنی باراش هێڕو ئەو دەستکەوتەی لە ئاشەکەدا دەبوو لە مزەی ئاشو کەرەستەی دیکە ، ئیتر ئەوەی وەبەر دەستیان بکەوتایە ئەوە زۆر بێ شەرمانە کۆیانو دەکردەوەو دەیان برد ، لەبەر ئەوە باراش هێڕەکان کە دەچوونە ئاش ئەوەی چەکی هەبوایە لەگەڵ خۆی‌دا دەی بردو کە شەو دەمانەوە خۆیانو ئاشو باراشەکانیان پێ پاس دەکردو . ڕێگەیان لە بەردەم پیاوخراپان تەسك دەکردەوەو ، بواری ئەوەیان نەدەدان بە هاسانی پەلاماری ئاشەکە بدەنو تالانی بکەن .

بەڵێ خوێنەری ئازیز ئەمەبوو کورتەیەکی چونیەتی دروست‌کردنو کەرەستەو کەلوپەلەکانی ئاشی ئاویان لێ پێك دەهات ، لە گەڵ هەندێ ڕەفتاری هامووشۆ کەرانی ئاشو

بردنی دەستو دیاری بۆ ئاشەوانو ژنەکەیو هەندێ نەریتی کۆن دەربارەی ئەو ئامێرە لە باو کەوتەی کە سالانی زوو چەند خزمەتێکی گەورەی بە ئادەمیزاد گەیاندووەو کوسپو گرفتی ژیانی بۆ هاسان کردووە . بەلام پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو بوژانەوەی باری ئابووریو بەرەوپیش چوونی باری کۆمەلایەتیو ، پەرەسەندنی زانستو زانیاری ئەمانە هەمووی بەسەر یەکەوە بواری بەکار خستنی ئاشی ئاویان تەسك کردەوەو بەرە بەرە ئەو نرخە گەورەیەی جارانی نەماو تەنانەت خەریکە هەر لە بیریش دەچێتەوەو لەلای نەوەکانی ئەم سەردەمەدا بە شتێکی خەیالیو کەم بەها لە قەلەم دەدرێ . هەر لەم روانگەیەدا دەلێم خۆزگە ئەم داموو دەزگا رەسمیو خاوەن دەسەلاتو پەیوەندی دارانەی بە پاراستنی کەلەپوورو کەرەستەی کۆنینە . هەولی نەفەوتانی ئەو کەلەپوورە بە نرخەیان دەداو تەنانەت هەندێ نموونەی ئەو ئاشو کەرەستانەی لە ئاشدا بەکار دەهاتن لە مۆزەخانەکانی وولاتدا دەپاریزرانو ، بایەخی خۆیان دەدرایێو لەبیر نەدەچوونەوەو لەبەر چاودا گوم نەدەبوون . هیواداریشم خوێنەرانو شارەزایان لێم ببوورن گەر هەندێ شتم لەبیر چووبێتەوەو ئامازەم بۆی نەکردبێ ، بە هەر حالێ داوا لەوانیش دەکەم کە ووردتر بیر بکەنەوەو گەر شتێکی تازەو ناونەبراویان وەبیردا هات بیخەنە سەر خەرمانەی ئەم باسەو ، ئەلبەتە هەمووﻻیەکیش مەبەستمان خزمەت کردنو پاراستنی کەلەپووری نەتەوەکەمانە ، بۆ ئەوەی هەر بە زیندوویی بمێنێتەوەو نەفەوتێ .

● سەرچاوەکان ●

● کۆمەلە زانیارییەکی تایبەتی خۆم دەربارەی ئاشو ئامێرو ئامرازەکانیو ، رۆژانی زووی ژیانی کوردەواری .

● گفتوگۆو پرسیار کردنو لێکۆلینەوەیەکی زۆر لەگەل هەندێ لە ئاش وەستا کۆنەکان کە لەو بوارەدا کاریان کردووەو ، شارەزاو پسپۆری زەمانی خۆیان بوون .

● کتێبی کوردەواری – دانانی مامۆستای نەمر علاءالدین سەجادی . لاپەرە ١٩٥ ٢٠٤ .

● گەلێ سەربردەو بەسەرهاتی دیکە کە لە نێو ئاشدا روویان داوەو بۆیان گێراومەتەوە ، بەلام لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی بە پێویستم زانی بۆ دەرفەتێکی تریان هەل گرم .

# پێنج پارچە هۆنراوەی فۆلکلۆری «ناوچـــــەی

مرۆڤ چ پیاو چ ئافرەت هەر لە دێر زەمانەوە بیری لەوە کردووەتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت رێبازێك بدۆزێتەوەو تێروانی بکات تاکو بە هۆیەوە سۆزو هەستو نەستی دەروونی خۆی دەربرێت بەرامبەر بە شارو گوندو ئەرزو شاخو خاکو ئاوو کێلگەو مالو مالاتەکەی ، یان خۆشەویستیو وەفایی خۆی بەرامبەر بە دلدارە شیرینەکەی پیشانبدات ، دلسۆزیو بەندەیی خۆی لە رووی خوای مەزنو پێغەمبەرانو ئەولیاو فریشتەو پەرستگا پیرۆزەکان دەربخات ، یان بتوانێت بە هۆیەك پەژارەو خەمی خۆی لە ناخی دەرونیا داماڵێو فرمێسکی قەتیسی سورو ئالی چاوەکانی پێ وشك بکاتەوەو زیاتر بتوانێت خۆی بەرامبەر بە کۆسپو رووداوی دل تەزێنی ئەم گەردونە راگرێ .

بێگومان بۆ ئەم هەموو مەبەستانەیش شیعریان هەلبژاردووەو کردوبانە بە هاودەمو هاوژیانیان لە کاتی خۆشیو ناخۆشیدا . دەبینین لە ئاهەنگی شاییو هەلپەرکێدا گۆرانی بێژانی دەنگ خۆش لە چوارچێوەی گۆرانیدا ئەو شیعرە فۆلکلۆریە ناسکانە دەلێنەوەو خوشترین ئاهەنگو زەماوەندو هەلپەرکێی پێ ساز دەکەن ، ئافرەتان لە کاتی مەشکە ژەنینو بێشکە راژەنیندا یان لە

# «گەرمـــــیان»

هەردەویل کاکەیی

شینی جگەر گۆشەو کەس و کاریاندا شیعری فۆلکلۆری بەکار دێنن ، لە کۆڕە ئایینی و تەصەوفیەکانیشدا دیسان ئەم کارە رەچاو کراوە بۆ ستایشی خوای مەزن و پێغەمبەران ، هەروەها شوان و گاوان و جوتیارو سەپانیش بەدەم ئیشو کارو جوتو دروێنەوە بە گۆرانی وتن رۆژیان بردووەتە سەر ، رێبوارو کاروانچیش لە رێگەو باندا بە دورو درێژی رێگاکەیان لەم شار بو ئەو شار لەم دێ بو ئەم دێ قۆناغ بە قۆناغ دەستیان ناوەتە بناگوێیان و بەدەنگێکی بەرزو زوڵاڵ گۆرانیی قەتارو ئەڵڵاوەیسی و خورشیدی و خاوکەرو ئای ئای و حەیران و سیاچەمان و هۆرەیان وتووە ، ژنانی لادێیش لە دەرەوەی دێدا بەدەم ئیش کردنی کشتوکاڵەوە یان لە کاتی کۆکردنەوەی چیلکەو هێزمدا گۆرانی سەوزەو هۆ لەیلێ و هەی بەناز بەنازو شیرینێ لەیلانێ و بەو بەوو هاوارەو لانکێیان وتووە .

**خوێنەری بەرێز :**

شایەنی باسە لە زووەوە نەتەوەکانی ئەم سەر زەمینە کەوتونەتە خۆیان و سامان و کەلەپوری خۆیان کۆکردوەتەوە پاراستویانە ، گەلێ بەرهەمی بەپێزو بەسودیان لە کتێب و نامیلکەو گۆڤارو رۆژنامەدا بلاوکردوەتەوەو لە نەمان رزگاریان کردوەو نامەخانەکانی خۆیانیان پێ دەوڵەمەند کردووە .

خۆزگە ئێمەیش وەکو گەلانی تر بایەخی تەواومان بە جیهانی فۆلکلۆری کوردی دەداو رەنجو کۆششمانیش دەکرد بۆ کۆکردنەوەی هەموو بابەتەکانی ئینجا دەمانخستە پێش تیشکی چرای رۆشنکەرەوەی رێی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن ، دەسا با زیاتر باسیان بکەین و بیانخەینە بەر باری زانستی بۆ ئەوەی خەڵکی باشتر لێی بکەن لە پێناوی گەشە سەندن و بزوتنەوەی فۆلکلۆری نەتەوەکەمان بو ئەوەی بتوانین بە ئاسانی کارو باری خۆشی و ناخۆشی رابوردومان دەست نیشان بکەین و شەقڵ و مۆری خۆمان وەکو گەلانی تر بخەینە روو .

وا لێرەدا برێك لە هۆنراوەی فۆلکلۆریتان پێشکەش دەکەم کەوا لە ناوچەی گەرمیان رەگو ریشەیان داکوتاوەو پەروەردە بوونەتەوە ، ئیتر فەرموون ئێوەو هۆنراوەکان :

— ١ —

**گۆرانی «سەوزە» ، ئەم گۆرانیە هی ژنانە ، ئاوازێکی تایبەتی خۆی هەیە .**

بەرکە وەملاوە کراس چیتی مۆر
خۆ من حاکم نیم راتکێشم بە زۆر
دایکەکەت بمرێ باوکت بێ ئیمان
چوونە وەبایس دڵەکەی هەردوکمان
ئەگەر نەبوایە بەبۆنەی تۆوە
من گرِ چیم ئەخوارد وەم کەشو کۆوە
ئەچم بەرێوە ئەژنۆم ئەلەرزێ
لێم بەجێ ماوە یەك گەردن بەرزێ
عەمرو عەزیزم هەر تۆ یارمی
هەر تۆ نۆ نەخشەی نۆ دڵدارمی
بۆ خۆی وێستایە هەم دێت و ئەچێ
چاو لە هەزاران دڵ لە سەر یەکێ

له ئەزەڵەی ڕۆژ ئەمە کارت بێ
بۆ مەیلت داپێم کێ زۆردارت بێ
هەڵسە بابڕۆین بۆ وڵات خۆمان
خێرەومەن زۆره خێر بکا پێمان
بێ وە ماڵەکەم وە سۆزەی کارێ
تا لە دڵ دەرچێ تۆزو غوبارێ
من دورو تۆ دور بەینێ ببەستین
بەفرمێسکی چاو سیروان هەڵبەستین
ئەگەر مەیلەکەت بچێ لە بیرم
سەد نەعلەت لە خۆم سەدیش لە شیرم
ئەگەر مەیلەکەم لە مەیلت کەم بێ
دڵەکەم هەوارەی تیغی دوو دەم بێ
ئەگەر مەیلەکەت بیەمە خێشان
چەمەکەم کۆر بۆ دەستم بکێشان
بالآکەت بەرزە بە قەد چنارێ
مەمکت خڕ بووە بە قەد هەنارێ
هەڵسە با بکەین دوو دەس لە گەردن
نەك پەیدا بێ لە ناکەم مردن
دڵەکەم بۆ دڵەکەت گەلێ ژان ئەکا
دەستڕ غەریبی بۆم ڕەوانە کە
دەستەسرەکەت سێ گوڵ حەبیبی
بۆمی بنێرە هام لە غەریبی
.بەر قاپی حەوشتان گۆلێ ئاو لە بن
کێ منی کوشتوە دشو براژن

* * *

-٢-

**وتو وێژی نێوان دوو عاشق :-**

**کچ دەڵێ :**

بێ وە ماڵەکەم گەردێ شەو پێوە
ڕەوانەت ئەکەم لەو ڕاستە ڕێوە
بێ وە ماڵەکەم بۆ شەو نشینی
چایەت بۆ لێ نەم هێلو دارچینی

**کوڕ دەڵێ :**

ماڵتان ماڵ هاوسێ کەلەکە بەرزە
هەتا دێمە بان پڕ دڵم لەرزە
بێ وە ماڵەکەم قەت مەچۆرەوە
خەمی سەد ساڵەم لە بیر بەرەوە
کراسەکەی بەرت وە گوڵ چنیایە
مەمکەکەت شلەو دەسی لێی درایە

**کچ دەڵێ :**

ئەگەر بۆم نەکەی لەو چیتە مۆرە
هاشات لێ ئەکەم موشتەریم زۆرە
ئەگەر بۆم نەکەی چیتی گوڵ غازی
هاشات لێ ئەکەم لە بەردەم قازی
دەمەکەت بێنە دەم لە بانی کەین
دەمو ساحێب دەم وە قوربانی کەین

**کوڕ دەڵێ :**

فیدای دەمت بام وە دگانەوە
ئەڵێی سەدەفە وە دوکانەوە
بالآکەت بەرزە حەزم کردوە لێت
حەسودیم نایا خودا داویە پێت
هەر پێنج پەنجەکەم نەزری ئەڵلا بێ
لە تۆ شیرینتر مەگەر خودا بێ
بالآکەت بەرزە بە قەد چنارێ
کێ تۆی لە من کرد بەردی لێ باری

**کچ دەڵێ :**

ڕەشە ڕەیحانە بنی لە گۆمە
یارێم گرتوە لە سنحی خۆمە
ڕەشە ڕەیحانە بنی لە شەتە
بارێکم هەیە تازە نۆ خەتە

**کوڕ دەڵێ :**

ڕەشە ڕەیحانە بنی لە زیخە
یارێم گرتوە ناوی وازیخە
ڕەشە ڕەیحانە شەو ئاوی لێکە
ئەویش بۆ یارم سلاوی لێکە

**کچ دەڵێ :**

چەپکێ ڕەیحانە خۆمی پێ ڕەش کەم
لە دوای باڵای تۆ دڵ بەکێ خۆش کەم
قاقەزێم نوسی بە خوێنی دڵم
بیدەن بە شەماڵ بیبا بۆ گوڵم

**کوڕ دەڵێ :**

بەس بێو بەس بچۆ بەم دەورو پشتا
جایەلانت کوشت خوام کرد بە گژتا
ئای هەناسەکەم وە قاوەی کاڵ بێ
گەورە تا بچوك وە کۆی زوخاڵ بێ

**کچ دەڵێ :**

خۆ من سەڵتە نیم شان لە شانت کەم
لە ناو جایەلان دەس نیشانت کەم

**کوڕ دەڵێ :**

کراسەکەت ڕەشە مەیدە لە دیوار
دڵ هەر دڵێکە مەیدە وە هەزار
داری پیرە دار قەت وە دار ناوێ
دۆست دور ولات قەت وە یار ناوێ
دەرەکەی سەرکەل شنەشنیەتی
خۆزگەم بەو کەسە فاتم ژنیەتی
کچە بیچکۆلە گۆنا ئاوێنە
تۆ مەرگی باوکت جامی ئاو بێنە

**کچ دەڵێ :**

کراسەکەت ڕەشە بۆ سەڵتە ناکەی ؟
خۆ من یاری تۆم بۆ باوەڕ ناکەی ؟
بەس بێو بەس بچۆ بەس بڵێ من هەم
بچێ وە گژتا ئای هەناسەکەم
ئەگەر ئەتەوێ دەرمکەی لە خەم
یان بە ماڵێ زۆر یان بە گفتەی دەم .

-٣-

**گۆرانی‌ی لاواندنەوە – ژنانە .**

لە دایك خۆم بیم بەختم خاس نەوی
سەرم لە مەینەت قەت خەلاس نەوی
سەرت ژان ئەکا بینە لە ڕانم
دڵم بهارەو هیچ لێی نازانم
گەر لە بیرم چی بیر مەرگم بێ
وەك قیمەی قەساو قیمەی جەرگم بێ
ئەترسم بمرم نەتبینمەوە
بە جوانە مەرگی سەر بنێمەوە
من ماڵەکەی خۆم دی بە وێرانە
مارانو موران لێی کردوی لانە
مانگاکانم هات لە قاپیەوە
جامەکەم هەڵگرت چومە پیریەوە
ئەوە بڕیاوە قەدیم وەجاغان
سەد قەستەم بخۆ وە هەوار کۆنیان
وتی بنیشین لە سای دیواران
ڕاز دڵ خۆمان کەین وەك سەیل باران
هاوسێم باری کرد تەنیا ماڵ وە خۆم
کۆتەرەی نیمە سوز کۆی زوخاڵ وە خۆم
هەتا بمێنم لە دنیای فانی
دڵم هەر کەیل بێ عەسرانم کانی
جوانان نەمرۆ خەیلێ بمانۆ
چەنی وای شەماڵ دەوران برانۆ
جوانان نەمرۆ حەیفەن سەد حەیفەن
چەنی وای شەماڵ دایم وە کەیفەن

چومە ئەو بانە جایەلاَن جەم بی
خەتای من چیە عومرتان کەم بی
بریَ یەتیم دیم لە پالَ دیواران
ئاخو داخیان بی چوین گونا کاران
یەتیم یەتیمەن یەتیم دیارەن
دایم رەنگ زەردو لیَوش وە بارەن
ئەو یەتیمانە شالَیان لە بەر کەن
لە دەستیان بگرن لە شاریان دەرکەن
یەتیمو یەخسیر کەی مەبۆش خۆشی
کونجیَ لە دۆزەخ جەهەنەم بەشی
چومە مالَەکەت هیچ نەدیمەوە
کۆرو پەشیمان هاتم چومەوە
با سەرت بشۆم بیکەم وە شانە
حەیفە لیَی ئەنشیَ تۆزی گۆرخانە
شایم بۆت نەکرد ناوردم وەوی
خۆ من نەمزانی لە چۆلَ ئەخەوی
بوخچەکەتم دی وە دەس دەلاَلەوە
دەلاَلَ ناشی بی بردیە مالَەوە
راوچی راو ئەکا وە لیَو چەمەوە
سمیَلَ قەیتانی وە لیَو دەمەوە
با بورمە بالاَت خورشیدی بیَگەرد
با بنشیَ وە بان پاو قۆندەرەی زەرد
فیدای شانت بم وە چاکەتەوە
نە لەرزیَ دەستت وە پاکەتەوە
مالَ وەجاغ کۆران عەساو کەشکۆلَە
ئیَوارە پریە بەیانی چۆلَە
مالَ وەجاغ کۆران کۆکۆ بیەوە
دۆستو دوژمنان لیَی شاد بیەوە
وەفای سەرت بم وە پشوینەوە
لە کیَ تۆراوی بابچینەوە

بۆ کویَ رۆییە کەیوانۆی ئەم مالَە
کونەی لە جەفتە مەشکەی لە تالَە
بیَ وە سەرینم تیَر بکە شینم
نەکا بمرم ئیتر نەتبینم
ئەریَ هۆ دایە وە دایەم نەوای
رۆژی لە رۆژان سەریَ لیَم نەیای
پیارزکەیەم گەرەکەن دایە بەستە بۆ
بکیان پەی یەخسیر هۆر نەگەستە بۆ
خۆزگەم بەو کەسە برای دیَ لە دور
دەس ئەکاتە ملی رەنگی ئەبیَ سور
دور ولاَت نەمرم غەریبیانە
لە (زەنقر) بمرم ولاَت خۆمانە
کەس دور وەطەن کەس کەس نییە
بۆ هاتو هاوار دەس برەس نییە
کەس دور وەطەن دوری ولاَتان
مەگەر کەمۆتر بەیۆ چە لاتان
کوژیا کوژیایە وە دالَەهۆوە
خوێن کوژیا ماسیا وە چوکلۆ چۆوە
نەخۆشی خاسە سەر لە سەرینە
کوژیا خەراوە دەس لە برینە
مەلە رەشەکە وە بانانەوە
دەنوکی ها وە بان شەهیدانەوە
کاغەزیَم بۆ هات لەم ناوە ناوە
کاغەز یەخسیرە دوعاو سلاَوە
خۆ من شایەر نیم وا بیم وە شایەر
ناوەکەم زریا لە چوار عەشایەر .

* * *

-٤-

**«لایلایە»**

رۆلَە بیَشکەکەت بومە سەر رایە

لایلات بۆ ئەکەم دایکەکەت بایە
لایلات بو ئەکەم لایلا وە لۆریٚ
بەڵکەم لە چاوت خەو خۆش نەتۆریٚ
لایلات بۆ ئەکەم لایلات وە دلٚ بیٚ
سەربنت رەیحان پایەت وە گولٚ بیٚ
لایلات بۆ ئەکەم وە (ماچۆ) زوانی
یاخوا قەت نەمری وە نەوجوانی
لایلات بۆ ئەکەم وە سۆزەی دەروون
یاخوا لە دنیا قەت نەوی زەبوون
لایلات بۆ ئەکەم خەو بتباتەوە
باوکت هیلاکە لە ئیش هاتەوە
لایلات بۆ ئەڵێم بە رۆژو بە شەو
پێم بڵیٚ چاوت بوچ ناچیٚ لە خەو؟
شیرەکەم نۆش کە نۆش گیانت بیٚ
چاوەکەی دایە بە قوربانت بیٚ
دە لایلا رۆڵە بۆت ئەڵێم لایە
ئیشو کارەکەم لە جێی خۆی مایە
لایلات بۆ ئەکەم لە پالٚ بێشکەکەت
ماڵو حالٚ ئەکەم قوربان چاوەکەت

-٥-

**«سۆز دەربرین»**

تەپەکەی (سەلیم) چاکڵە گوێزێکە
گشتی وە قوربان سوغمە سەوزێکە
تەپەکەی (خەڵەف) نم نم رِلِ ئەکا
ئەو کورە کێیە دۆستی بانگ ئەکا
سویندم خواردووە وە تەپەی (دوسەر)
دڵم لە لاتە تا وە رۆژ مەحشەر
تەپەکەی (عوزێر) پر داوانێکە
ئەویش وە قوربان نەوجوانێکە
تەپەکەی (چاوش) دو مشتە خۆڵە
بیٚ وە قوربان ئەو نەرمو نۆڵە
دەشت (قەتار تەپە) جاگەی باوانە
قەدیم مەنزڵگای شوانو گاوانە
پر کیسەیەکە تەپەکەی (ئاسیاو)
ئەیکەم وە قوربان تاڵیٚ زوڵفی خاو
تەپەکەی (ئەسمەر) پر داوانێکە
ئەویش وە قوربان دەزویرانێکە
جۆگای کۆردەرە پر دلی قارە
بیٚ وە سێقەی ئەو تاقە یارە
تەپەی (تەلە دیاب) پر تایە جواڵە
ئەویش وە قوربان ئەو چاو کەژاڵە
دەشتەکەی لاسین بەیارو شۆمی
ئەویش وە قوربان یارەکەی خۆمی
حاوی (دێرەکان) زنخو قاچەکەی
بیٚ وە قوربان لێوە ئاڵەکەی
ئاوەکەی (کێلی) لە گەلٚ رۆخانە
بیٚ وە قوربان ئەو چاو جوانە
قەبرێم بو بکەن لە تەپەی (مەرمەر)
باوەشێنم کەن وە رەیحانەی تەر.

ئەم هەڵبەستانەم لەم ئافرەتانە بە دەست هێناوە: «پوریٚ فەخریە، دایکی هوشیار، پوریٚ مینا دایکی محەمەد. ئاغاژن (س. ح) دایکی سلێمان، خوشکە رافیدە دایکی بەشدار». پر بە دلٚ سوپاسی هەموویان دەکەم. خوا یاریان بیٚ.

خوێنەری ئازیزو بەرێز: ئەم شیعرانە چۆن لە زارم وەرگرتووە هەر بەو جۆرە بەبیٚ دەست کاری لێرەدا بلاوم کردووەتەوە.

ئەو گردو تەپلۆسکەو شوێنو مەڵبەندانەی کە ناویان هاتوە لە هۆنراوەی پێنجدا هەموویان لە ناوچەی کاکەیین لە هەرێمی تاوغ = (داقوق).

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

**هەولێر** دژوار

## کۆڕێکی پزیشکی

بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەر لە رۆژی ٩٨٦/١١/٢٦ لە هۆڵی رۆشنبیری جەماوەردا کۆڕێکی زانستیو پزیشکی لە ژێر ناونیشانی (قەڵەویو گیروگرفتەکانی بەکارهێنانی دەرمانی قەڵەوبوون)دا ، بۆ قوتابی کۆلیجی پزیشکی بەڕێز جلال صدیق صالح سازکرد . لە سەرەتاوە کاك عمر ابراهیم عزیز بەخێرهاتنی ئادمادەبوانی کردو کاك جلالی بە ئامادەبوان ناساند . ئینجا کاك جلال صدیق بەم پێشەکیە خزیە نێو باسەکەی : (قەڵەوی دەردێکی هێجگار کۆمەڵایەتیو بڵاوەو دیاردەیەکی نامۆی کۆمەڵگایە ، تا ئێستا نەتوانراوە بەشێوەیەکی تەواو باس بکرێت ، هەرکۆمەڵێك لە پزیشکەکان بە جۆرێك لێکی ئەدەنەوە ، هیچ گومانی تێدانییە کە گرنگترین هۆکارەکانی قەڵەوی زۆر خواردنە ، ئەوەی شیاوی باسە خۆراکیش بەشێکی گەورەو گرنگی ژیانەو ، جا بۆ ئەوەی ژیانی ئادەمیزادو گیانەوەران بەڕێوە بچێت ، ئەندامەکانی لەش پێویستیان بە



ووزه دەبێت بۆ چەسپاندنی کارە تایبەتی‌یەکانی خۆیان وەك : هەناسەدان ، سووڕانی خوێن لە لەش‌دا ئەرکەکانی گورچیلە . . .) .

دوا بە دوای ئەم پێشەکیە برای موحازر کەوتە جیهانی زانست‌و زاراوەی پزیشکی . . تا دەستی خستە سەر دەردە قەڵەوی‌و ماوە ماوەیش بە سلایدات‌و فانوسی سیحری‌و ئادەمیزادێکی لاستیك بە چەندان نموونەی دەردە قەڵەوی سەرمەستی کردین ! باسەکەی کاك جلال بەم شێوەی خوارەوە دابەشکرابوو :

● **پێشەکی باسەکە**

● چۆنیەتی هەست‌کردن بە برسیەتی‌و تێربوون .

● قەڵەوی : قەڵەوی چی‌یە ؟ جۆرەکانی قەڵەوی ، هۆیەکانی قەڵەوبوون ، ماکەکانی قەڵەوی ، دەست نیشان کردنی قەڵەوی ، چارەسەرکردن .

● **قەڵەوی‌و چەند نەخۆشی‌یەك** :

* نەخۆشی کوشینك Cushing Syndrom .
* نەخۆشی ئاوسانی شانەکان (ئەکرۆمیگالی Acromegally) .
* نەخۆشی میگزیدیما Myxedema .

● **گیروگرفتەکانی بەکارهێنانی دەرمان بۆ قەڵەوبوون** :

دەرمانەکانیش ئەمانەن : دکسون Dexon ، پریسۆلۆن Presolon ، سلستۆن Celeston ، دیورەبۆلین Decadurabolin ، پێریەکتین Periactin .

بەراستی ئەم جۆرە کۆڕە زانیستیانە کاریگەرو پێویستە بۆ زێدەکردنی ڕۆشنبیری پزیشکی‌و زانستی ، ئەو کارە پیرۆزەیش ئەنجامێکی باشی دەبێ لەسەر بیروهەستی کۆمەڵگای کوردەواری . ئەوەی شایانی باسەو بۆ یەکەم جاریشە ئەم پزیشکە بەرێزانە ئامادەی ئەم جۆرە کۆڕانە بوون : جعفر حەمەد قادر ، نزار محەمەدەمین ، سەرتیپ کاکەیی . سەرەرای کۆمەڵێك قوتابی کچ‌و کوڕانی زانکۆی صلاح‌الدین هەروەها چەندان ئەدیب‌و ئەدەب دۆستان .

لەکۆتایی باسەکەی قوتابی پزیشکی . کاك جلال کۆمەڵێك لە ئامادەبوان گفتوگۆیان لەسەر باسەکە کردو مشت‌ومڕێکی زانستانە لە لایەن قوتابیە پزیشکیەکان‌و دکتۆرە بەرێزەکان‌کرا ، هەروەها برادەرانی ئەدەب دۆستیش ویستیان بخزنە نێو جیهانی پزیشك‌و زانست ، ئەسعەد عەدۆیش یەکێك بوو لەو کەسانە وەك ئامۆژگاریەك بۆ برای موحازیر وتی : بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنایی لەگەڵ ئەم جۆرە کۆڕانە پەیدا بکەین‌و زیاتری تێ‌بگەین





پێویسته برای کۆرگێر ئەو زاراوە زانیستیانه به زاراوە فۆلکلۆریەکان ببەستێتەوە به واتایەکی‌تر ئەو نێوە میللیانه تا چ رادەیەك راستەوخۆ پەیوەندی به نێوە پزیشکیەکان هەیه ، هەروەها خۆزگەی ئەوەی خواست که ئەم جۆرە کۆرانه پێویسته بکردرێن . ئەوەی شایانی باسه ئەم کۆرە دووەم کۆری کاك جەلاله لەدوای مایەسیری‌دا .

**شانۆ .**

تیپی شانۆی ئامادەیی بازرگانی کوران له رۆژی ۹۸٦/۱۱/۲۳ له هۆڵی قوتابخانەکەیان‌دا شانۆگەری (سەرتاشخانەی رەشۆ) نووسینی حسین زارین‌و دەرهێنانی دڵگەش عزیز سیدا پێشکەش کرد . ئەم هونەرمەندە تازە پێگەیشتوانه بەشداری ئەم شانۆگەرییەیان کردووە : محمد عمر شریف – رەشۆ ، یوسف احمد – عەلۆ ، انور اسماعیل – پوشۆ ، هەڵمەت طاهر – صوفی صابر ، جلال پەریشان – حاجی وسو ، کمال عثمان – حاجی (۱) پۆلیس (۱) ، عبدالرحمن ابراهیم – حاجی (۲) ، خطاب حامد کاروانی – قۆمیسەر ، صابر حسین – پۆلیس (۲) ، هەروەها برایان نەبەز فقێ‌و گیلانی خۆشنووس لەگەڵ چەند ئەکتەری شانۆگەریەکه بەشداری کاره هونەریەکەیان کردووە .



تیپی شانۆی کاروان له رۆژی ۹۸٦/۱۱/۲٤ له هۆڵی مەڵبەندی لاوانی شەهید ابراهیم‌دا شانۆگەری (درامای وەڵام) نووسینی صبحی احمد کۆیی‌و ئامادەکردن‌و دەرهێنانی مؤید محمد فقێ پێشکەش‌کرد . ئەم چوار ئەکتەرانه ناوەرۆکی درامای وەڵامیان پێشکەش به ئامادەبوان‌کرد : کمال عزیز – قاله فەراش ، قادر ابراهیم – دکتور وسو ، جمال عثمان – سەلیم سلیمان ، محمد کۆیی (رزگار) – هۆمەر شێخ محمد . ئەم برادەرانەیش بەشداری کاره هونەریەکەیان‌کرد : حسن صالح داماو ، حسن جبار ، برهان محمدامین ، مؤید فقێ ، جمال عثمان ، قادر ابراهیم ، محمد کۆیی ، رزگار احمد .

**چیرۆك خوێندنەوە**

رۆژی چوار شەممە رێکەوتی ۹۸٦/۱۲/۱۰ له هۆڵی رۆشنبیری جەماوەر وەرزی تازەی یەکێتی ئەدیب‌و نووسەرانی کورد لقی هەولێر ، بەئێوارە کۆرێکی چیرۆك خوێندنەوە تایبەت بەچیرۆکنووس مامۆستا رەزا سەید گوڵ بەرزنجی دەستی پی‌کرد . لەسەرەتاوە کاك شیرزاد عبدالرحمن سەرۆکی لێژنەی رۆشنبیری له یەکێتی نووسەراندا بەم خاڵانەی خوارەوە چیرۆکنووسی به ئامادەبوانی کۆرەکه ناساند :

* مامۆستا رەزا سەید گوڵ له ساڵی ۱۹٤۷ له دایك بووە .
* لەساڵی ۱۹۷٥ دەستی به نووسین کردووە ، لەهەردوو دیداری چیرۆکی کوردیدا بەشداری کردووە ، یەکەمیان به چیرۆکی (بروسکه) که له هاوینه هەواری سەری رەش‌دا بەسترا ، دووەمیشیان به چیرۆکی (خەم‌و خەون) که له هەولێردا سازکرد .
* یەکەم چیرۆکی به ناوی (شووشەیێ خوێن)ه ، که له کاتی خۆیدا له گۆڤاری بەیان بلاوبۆتەوە . ئەم بەرهەمانەی که تا ئێستا بەچاپی گەیاندوون :
* **شووشەیێ خوێن کورته چیرۆك ۱۹۷۸ .**
* **دیدارێکی دوور چیرۆکی درێژ ۱۹۸٤ .**



• چاوە ماندووەکان کورتە چیرۆك ١٩٨٥ .

دوا بە دوای ئەمە مامۆستا رەزا بەرزنجی هاتە سەر خوێندنەوەی چیرۆکەکانی ، یەکەم چیرۆك بە ناوی (رەشەبا) بوو ، ئەم چیرۆکە زۆر کورت بوو ، ناوەرۆکەکەیشی باسی رەشەبایەکی ترسناکی دەکرد . بەلآم چیرۆکی حەوت لەقتە لە بازارێکی ئەم سەردەمەدا باسی بازاری مۆدەو مۆدەکاری دەکات کە چەند ساڵێ لەمەوبەر لە پیشانگاکان سەری هەڵدا بە حەوت لەقتە چەند لایەنێکی ئەو مامەلە سەیرە پیشان دەدات ، زۆربەی ئەمانەی مۆدەیان دەکرد چییان لێ‌هات ؟ .

چیرۆکی باڵندە باسی رەوە باڵندەیەکی گۆشت خۆری زەبەلاح دەکات کە هێلانەیان کردووەو هێرش دێننە سەر دێکان . خۆشەویستی دێو مەترسی هێرش هێنانی ئەو باڵندانە لە چاوی شوانی دێکە دەنگ دەداتەوە ، لەگەڵ هێرش هێنانی ئەوباڵندانە شوانە مژدەی کاریلەیەکی تازەو ساوایەکی مام سمایل رادەگەیەنێ .

چیرۆکی (ماچ)یش باسی ئافرەتێك دەکات ، مێردەکەی کەم لە ماڵ دەبێ ئینجا لەبەر هەر هۆیەك بێت ، ژنە دەست لەگەڵ پیاوێکیکە تێکەلاو دەکاتو کورەکەی دەیەوێ لێی ئاشکرا بکاتو لە ترسان ژنە لە ناوی دەبات . دوایش لێی ئاشکرا دەبێتو بە سزای خۆی دەگات .

دوا چیرۆکی کۆرەکە (موعجیزەی خۆشەویستی) بوو ، ئەو خۆشەویستی‌یەی موعجیزەیەك دروست دەکات کە بە هۆی تەلەفۆنەوە لە نێوان کورێكو کچێکی ئفلیجدا سەرهەڵدەدات بەبێ ئەوەی کورەکە بەمە بزانێو دەبێتە هۆی گۆرانی باری ئیفلیجی کچە رووەوباشی . بەردەوام بوونی ئەو پەیوەندی‌یە روحی‌یە بە ئامانجێکی باشدا دەشکێتەوە .

دوا بە دوای خوێندنەوەی چیرۆکەکان کۆرگێر دەرگای گفتوگۆی خستە سەر پشتو گەلێ لە ئەدیبو ئەدەب دۆستان بەشداریان کرد ، کۆرەکەش دوو سەعاتی خایاند .

## چلەی ماتەمینی شەماڵ سائیب

نەقابەی هونەرمەندان بەهاوکاری لەگەڵ سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین ، چلەی ماتەمی شەماڵ سائیبی هونەرمەندو مرۆڤیان لە رۆژی ١٩٨٦/١٢/١٧ لە هۆڵی رۆشنبیریو لاوان گێرا .

لەسەرەتاوە ناظم دڵبەندو صباح عبدالرحمن بەخێرهاتنی ئامادەبوانیان کرد . ئاهەنگی چلەمین بەم شێوەی خوارەوە پێشکەش‌کرا :

• چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز لە لایەن مەلا جەرهیس هەولێری خوێندرایەوە .
• وتاری سەرۆکایەتی زانکۆ لەلایەن د. مؤید صالح خوێندرایەوە .
• وتاری نەقابەی هونەرمەندان لەلایەن هونەرمەند جمال هدایت خوێندرایەوە .
• وتاری دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی لەلایەن رۆژنامەنووس شیرزاد عبدالرحمن خوێندرایەوە .
• یادگاری هونەرمەند باکوری لەگەڵ خوالێ‌خۆشبو شەماڵ سائیب .
• یادگاری هونەرمەند فؤاد احمد لەگەڵ خوالێ‌خۆشبو .
• پووختەی ژیانی خوالێ‌خۆشبو لەلایەن هونەرمەند شیرزاد عوزێری خوێندرایەوە .

* گفتوگۆیەکی خوالێخۆشبوو کاك دڵبەند بە ڤیدیۆ پیشاندرا .
* چەند گۆرانیەیەکی خوالێخۆشبو لەلایەن تیپی هونەرمەندانی هەولێر پێشکەش کرا .

رەحمەتی نێوی (شەماڵ جەلال سائیب)ە ، لە ساڵی ١٩٣١ لە شەقلاوە لەدایك بووەو خەڵکی شاری سلێمانیە . یەکەم گۆرانی لەساڵی ١٩٤٧ لە رادیۆی کوردی وتووە ، لەساڵی ١٩٥٥ لە کۆلێژ وەرگیراوەو لە بەشی مێژووی ئیسلامیدا خوێندوە . بۆتە مامۆستای چەندان قوتابخانەی بەغدا ، ماوەی (٢٩) ساڵ ئاوارەی کوردستان بووە . شەهادەی ماجستێری لە ئەمریکا وەرگرتووە .

هونەرمەندی خوالێخۆشبو ئەم مندالآنەی لەدوا بەجیٚماوە سام ، ژیوٚڵ ، تیشکۆ ، ئەوەی شایانی باسە چەندان بروسکە لەلایەن دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەو یەکێتی ئەدیب‌و نووسەرانی لقی هەولێرو کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی هەولێرو تیپی باواجی‌و تیپی هونەری میللی هەولێرو رادیۆی کوردی بەم بۆنەیەوە لێدرا .

سلاوو چەپکێك گوڵ بۆ سەر گۆری هونەرمەندی کورد شەماڵ سائیب . خۆزگە هەموو ساڵێك هونەرمەندان رۆژی ٩٨٦/١١/٧ یادبکەنەوە .

## سلێمانی

-ئازاد

● **شانۆ :-**

«پلنگەکان لە رۆژی دەیەمدا»

لە نووسینی چیرۆکنووسی عەرەب «زەکەریا تامر»و وەرگێرانی بۆ کوردی «ئازاد بەرزنجی»و دەرهێنانی هونەرمەند «عوسمان فارس» ، پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە سلێمانی - پۆلی پێنجەمی شانۆ‌شانۆیی «پلنگەکان لە رۆژی دەیەمدا» یان لە سەر شانۆی پەیمانگای ناوبراو پێشکەش کرد .

دەرهێنەری ئەم شانۆیی یە ، کە لە چیرۆکێکی نووسەرەوە کە بە هەمان ناونیشانەوەیە بۆ شانۆ ئامادەکراوە ، زیاتر لە روانگەیەکی ئەزموونگەریانەوە ئەم کارە شانۆیی یەی پێشکەش جەماوەرکرد .

ئەو ئەکتەرانەی لەم بەرهەمەدا بەشداربوون :-
(سۆران ئیسماعیل - رامکەر ، ئاکۆ عومەر - پلنگ .
ئاشتی مەجید - دایك ، عومەر حەسەن - درندە .
سەربەست ئەحمەد - درندە ، بەیان مەحموود - گۆرانی بێژ) .

«چارەنووسی ئادەمیزاد»

ئەمە ناوی چیرۆکێکە لە چیرۆکەکانی رۆماننووسی مەزن «میخائیل شۆلۆخۆف» کە لە ئامادەکردن‌و دەرهێنانی هونەرمەندی لاو «مەریوان عومەر» وەکو کارێکی شانۆیی لە سەر تەختەی شانۆی سانەوی‌ی سەلاحەددین لە سلێمانی پیٚ‌ی ئاشنابووین .

ئەگەرچی ئامادەکردنی چیرۆك بۆ شانۆ کارێکی هێندە ئاسان نی یە ، بەلآم دەرهێنەر توانیبووی هێڵە سەرەکی یەکانی چیرۆکەکە بپارێزێت‌و لە هەمان کاتداو بە بێ پەنابردنە بەر دیکۆرێکی قورس‌و نەخشین لە چەند دیمەنێکی ساکارو جوانداا رووداوەکان بەرجەستە بکات .

ئەکتەرەکان بریتی بوون لە :- (سۆران ئیسماعیل - سۆکۆلۆف ، شێرکۆ عادل - نووسەر ، دارا رەوف - ڤانیا .
خاوەر محەمەد - کەسی یەکەم ، بەکر مستەفا - کەسی دووەم .
سامان عوسمان - کەسی سێیەم ، ئامانج ئیبراهیم - کەسی چوارەم ، بەڵێن جەلال - کەسی پێنجەم) .

لەو هونەرمەندانەی کارە هونەری یەکانیشیان گرتبووە ئەستۆ :-

مامۆستا ئەحمەد سالار - بەرێوەبەری بەرهەم
غەمگین فەرەج - مۆسیقاو ئاواز
حیکمەت هیندی - پۆستەر
کامەران رەسوول - رووناکی

ڕێبوار ئەمین

نەوزاد تۆفیق - خۆشنووس

ئەم شانۆیی‌یە کە لە ڕۆژی ٢٠-١٢-١٩٨٦ەوە دەستی پی‌کرد دوابەرهەمی تیپی شانۆی سالاربوو لە وەرزی شانۆیی‌ی سالی «٨٦»یدا ، بە هیواین بەرهەمەکانی سالانی داهاتووی لە ڕووی چەندێتی‌و چۆنێتی‌یەوە گەشەدارتربێ .

«پەتا سپیکە»

لە نووسینی درامانووسی چیکی «کارل چاپك»و وەرگێرانی لە عەرەبی‌یەوە بۆ کوردی چیرۆکنووس کاك «مستەفا سالح کەریم»و دەرهێنانی هونەرمەندی لاو «ئەریوان عومەر دەولەت» ، بەڕێوەبەرایەتی‌ی ڕۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی شانۆیی‌ی «پەتاسپیکە»ی لە ڕۆژی ٢٣-١٢-١٩٨٦ وڕۆژانی دوایی‌یەوە لەسەر شانۆی ئامادەیی‌ی سلێمانی کوڕان پێشکەش‌کرد .

ئەو ئەکتەرانەی لەم بەرهەمەدا بە نواندن هەلسان :-

(عوسمان مەعروف - د . جالین ، ڕزگار باهیر - مارشال ، هاوڕێ حەمە سالح - بارۆن گریك ، جەزا عەلی - د . سیجیلیوس ، «دلشاد عەلی»و «کامەران ڕەفیق» - باوك ، «درەخشان ئەحمەد»و «ڤیان کەمال» - دایك - کچ - ئەنیتا ، نەوزاد ئەحمەد - پاڤل ، هاوڕێ مستەفا - کوڕ ، ئەحمەد عەبدولرەحمان - یاریدەدەری یەکەم ، ئاوات محەمەد - یاریدەدەری دووەم) . کۆرسی خەلکی شاریش لەمانە پێکهاتبوو :- (بورهان غەفور ، جەبار مەعروف ، سەردار محەمەد ، ئیبراهیم محەمەد ، بەهادین عەبدولا ، هاوڕێ مستەفا) .

بەڕێوەبەری شانۆ کاك «هاوڕێ حەمە سالح» بوو .

دیکۆری شانۆیی‌یەکە هونەرمەندی لاو «وەهبی ڕەسوول» نەخشەی کێشابوو ، هۆنراوەی پێشەکی‌یەکەش شاعیر مامۆستا «حەسیب قەرەداخی» نووسیبووی .

● **کۆڕ :- ئیڤالت لەڕوانگەی مێژووەوە**

ئەمە ناونیشانی ئەو باسەبوو کە خاتوو لەیلان لە کۆڕێکدا خوێندی‌یەوە کە بەڕێوەبەرایەتی‌ی ڕۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی لە ئێوارەی ڕۆژی پێنج‌شەممە ڕێکەوتی ١٨-١٢-١٩٨٦ لە هۆلەکەیدا بۆی سازدا .

«ئیڤالت» وەك خاوەن باس ڕوونی کردەوە لە بنەڕەتدا ناوی کابرایەکی یۆنانی‌یە کە کاتی خۆی لە جەنگی نێوان فارسەکانو یۆنانی‌یەکاندا ، کاتێك فارسەکان دەیانەوێ شاری «ئەسپارتە» بگرن بۆ گەیشتن بەو مەرامەیان یاریدەیان دەداتو بەم کارەی خیانەت لە خاكو گەلەکەی خۆی دەکات ، جالەم ڕوانگەیەوە خاتوو لەیلان لە باسەکەیدا ئاماژەی بۆ زۆر لەو «ئیڤالت»انە کرد کە لە مێژووی گەلی کورددا ڕۆلێکی شۆفارانەیان دیوەو بەمە چوونەتە خانە ڕەشەکەی یادی مرۆڤایەتی‌یەوە .

دوای خوێندنەوەی باسەکە نووسەران مامۆستا «مستەفا سالح کەریم»و «ئومێد ئاشنا» ڕۆشناییان خستە سەر باسەکەو پاشان کۆتایی بە کۆڕەکە هێنرا .

«ئێوارە کۆڕێکی شیعری»

هۆلی ڕۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی چەند شاعیرێکی لاوو کۆمەلێك ئەدەب دۆستو ئەوینداراني شیعری لە کۆڕێکدا کە تایبەت بوو بە خوێندنەوەی شیعر لە ئامێزگرت ، کە لقی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی لە سلێمانی سازی دابوو .

لەم کۆڕەدا هەریەکە لە شاعیران (هیدایەت عەبدولا حەیران ، بەرزان هەستیار ، عەباس سالح عەبدولا ، دلشاد عومەر کاکی‌و هوشیار بەرزنجی) بە چەند پارچە شیعرێك بەشداریان کردبوو .

دوای ئەوەی بەڕێوەبەری کۆڕ برای شاعیر «جەمال

  

غەمبار» وتەیەكی سەبارەت مەزنی‌و ئەفسوونی پەنهانی جیهانە فراوانەكەی شیعر خوێندەوە ، برا شاعیرەكانی بە ئامادەبووان ناساندو پاشان بەم جۆرە دەستیان بە خوێندنەوەی شیعرەكانیان‌كرد :-

«هیدایەت عەبدولآ حەیران» شیعری :- (شاسواری شەو ، خۆڵەمێشی كارەساتێك ، بەشێك لە شیعری «ئێمە هەموومان بارانی پەڵەین») .

«بەرزان هەستیار» شیعری :- (سەدای یاخی بوونێكی پیرۆز ، سەفەرێكی نائومێدبوو كشایەتەوە ، ساتی ئەشك‌و بیرەوەری ، رەوەند ، یادو تەرم‌و زامێكی تەر) .

«عەباس ساڵح عەبدولآ» شیعری :- (ئەو شەوانەی كە رازی تیا ئەسووتێ ، تەنیایی ، وەرزی خەمە سوورەكان ، گڕ ، هەڵدێرو سڕبوون لە هەڵەشەییدا ، گڕو هەروەها پارچە شیعرێك كە ناونیشانی بۆ دانەنابوو) .

«دڵشاد عومەر كاكی» شیعری :- (گوڵی سپی ، پەنجەرە ، راچەنین ، دوو پارچە شیعر ، یەكبوون ، سێ وێنە) .

«هوشیار بەرزنجی»یش بەم پارچە شیعرانە :- (تاڵی‌و ئارام ، پێشوازی ، ئاڵوی قژزەرد ، من عاشقم) كۆتایی‌ی بە خوێندنەوەی شیعرەكان هێناو بەمەیش كۆڕەكە كۆتایی پێ هێنرا .

**-«شێخ رەزا» لە كۆڕێكدا-**

«دەربارەی شێخ رەزای تاڵەبانی» ناونیشانی ئەو باسە بوو كە كاك س . ع . شادمان لە كۆڕێكدا خوێندی‌یەوە كە دوا كۆڕی وەرزی رۆشنبیری‌ی لقی دەزگای رۆشنبیری‌و بلآوكردنەوەی كوردی‌بوو لە سلێمانی‌و لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی‌ی رۆشنبیری‌ی جەماوەر لە رۆژی ۱۹۸٦/۱۲/۲۲داو بە ئامادەبوونی كۆمەڵێك لە ئەدیب‌و ئەدەب دۆستان بۆی سازدا .

. دوای ئەوەی برای شاعیر كاك «فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی» كە كۆڕەكەی بەڕێوەدەبرد بە شیعرە بالآكەی شاعیر «لە بیرم دێ سولەیمانی كە دار الملكی بابان بوو» كۆڕەكەی دەست‌پێ‌كرد ، كاك س .ع . شادمان دەستی بە خوێندنەوەی باسەكەی‌كرد ، سەرەتا سەبارەت ژیانی شاعیری هەجوو دوا كە چۆن سەرەتای خوێندنی چوونە حوجرەی ئەو دەمە بووەو هەر لەوێدا «گولستان»و «بوستان»ی شاعیری ناوداری فارس «سەعدی‌ی شیرازی»ی خوێندووەو ئەمە یەكێك بووە لەو هاندەرانەی تۆوی ئەوینی شیعری لە دڵی شێخدا چاندووە . هەروەها خاوەن باسی دیاردەی بۆ ئەوەكرد كە شاعیر سەرەتا لە ژێر لەقەبی «لامیع»دا شیعری بلآو كردووەتەوەو جگە لە زمانی كوردی بە فارسی‌و عەرەبی‌و توركیش شیعری نووسیوەو نەك بە تەنها لە هەجوودابەڵكوخۆی لەقەرەی شیعری كۆمەلآیەتی‌و دڵداری‌و هەروەها ستایشیش داوەو لە بەكارهێنانی جیناسیشدا لێزان‌و كارامەبووە .

لە راستیدا باسەكە زیاتر وەبیر خستنەوەو چاو پیاخشانێكی خێرابوو سەبارەت ئەو شاعیرە بلیمەتەو مۆركی زانستی‌و مەنهەجیەتی بەخۆوە نەگرتبوو .

لە كۆتاییدا بەڕێزان «عەبدولقادر دەباغی ، جەمال غەمبار ، هیدایەت عەبدولآ حەیران ، ئومێد ئاشنا ، كەریم زەند» راو باری سەرنجی خۆیان سەبارەت باسەكە خستە ڕووو بەمە كۆڕەكە كۆتایی‌ی هات .

● **پێشانگا :-**

«بەڕێوەبەرایەتی‌ی رۆشنبیری‌ی جەماوەر
لە سلێمانی‌و دوو پێشانگا»

۱ - پێشانگای تایبەتی‌ی «كامەران حەمە ساڵح» :-

لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی‌ی رۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی‌یەوە پێشانگایەكی تایبەتی بۆ هونەرمەندی لاو «كامەران





حەمە سالّح» لە هۆڵی «مۆزەخانەی سلێمانی»و لە ڕۆژانی ٢١-١٩٨٦/١١/٢٧دا کرایەوە .

کاك کامەران لەم پیشانگایەدا سی‌و دوو تابلۆی خۆی پیشان دابوو لەوانە :- (وەلی‌و شەم ، ژوان ، دڵدارێکی کوێر ، عاشق‌و گوڵ ، مردن ، گیتار ژەنێك ، هاوارکردن) .

- هونەرمەند لە ساڵی ١٩٦١دا لە سلێمانی هاتووەتە دنیاوە .

- قوتابی‌ی بەشی ئەندازیاری‌ی ئامێرو کانەکانە لە زانکۆی تەکنۆلۆجیا لە بەغداد .

- لە ساڵی ١٩٨٦دا یەکەم پیشانگای تایبەتی‌ی خۆی لە زانکۆی ناوبراو کردووەتەوە .

٢ - **پیشانگای تایبەتی‌ی هونەرمەندی لاو «هیوا عومەر»** :-

هەر لە لایەن هەمان بەڕێوەبەرایەتی‌یەوەو لە ڕۆژانی ٢٠-١٢ تا ٢٧-١٢-١٩٨٦و لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی پیشانگایەکی تایبەتی بۆ هونەرمەندی لاو «هیوا عومەر» کرایەوە .

کاك هیوا چل کاری هونەری‌ی خۆی لەم پیشانگایەدا پیشاندا کە تێکەڵبوون لە کاری :- ڕۆنی ، باستیل ، مەرەکەب ، جاف‌و ، پێنووسی ڕەش .

- کاك هیوا عومەر لە ساڵی ١٩٦٧دا لە سلێمانی هاتووەتە دنیاوە .

- قوتابی‌ی پۆلی دووەمی ئامادەیی‌ی پیشە سازی‌ی سلێمانی‌یە .

## دهۆك

مدتن

**«کۆڕەك ب‌بیرهاتنا شاعرەکێ خودێ لێخوش»**

دچارچوڤێ کوڕێت ناڤخویی‌دا یێت ئێکەتیا نفیسڤانێت کورد تایێ دهوکێ ، کۆڕەك هاتە سازکرن بو تورەڤانێ گەنج کامیران بەرواری ل ڕێکەفتی ١٩٨٦/١١/١٣ . هێژایێ موحازر دڤێ کوڕی‌دا بومە ل سەر شعرو ژیانا شاعرێ گەنجێ خودێ لێخوش (محمد عبدالله مایی) ئاخفت .

پێداچونا وی ل سەر خالێت ژێری‌بون :

- هزرو بیرێت شاعری بو ژیانێ‌و پاشە ڕۆژێ :
- ئەڤینی‌و نیشتمان پەروەری .

ئەڤە پشتی دان‌و ستاندنەکا بەرفرەهـ کۆڕ ب‌دوماهی هات‌و نێزیکی سەعەتەکێ کێشا .

**«بەندێ‌و گەریانەك ل کوردستانێ»**

ژ چالاکیێت ئێکەتیا نفیسڤانێت کور - تایێ دهوکێ ، ل ڕێکەفتی ١٩٨٦/١١/١٥ کۆرەك هاتە سازکرن بو هێژا د . یوسف‌حبی ل ژێر ناڤ‌و نیشانێت «گەریانا گەروکێ فرەنسی هنری بەندێ ل کوردستانێ» سەیدا عبدالکریم فندی کور گێرا .

ژ ئێڤە سەیدایێ موحازر بەحسێ گەریانێت بیانیا دکەت دبێژیت : ئەڤ گەریانە ب لشت‌و مفانە ژبەرکو وان دهندە قوناغێت تاری‌دا تشتێ باش بومە تومارکریە . پاش بەحسێ ڤێ گەریانێ کر ئەوا ل ١٥ تەباخێ ل سالا ١٨٨٥ دەست پێکری‌و پشتی شەش هەیڤا بکوتایی‌هات . پشتی دو سالا ژڤێ گەریانێ بەندێ پەرتوکەك دانایە (٢٠٠) وێنەو تەختیتاێت ژێهاتی تێدانە . هێژایێ موحازر ئەڤ پەرتوکە وەرگێرایە زمانێ عەرەبی‌و نهو ل چاپی‌یە .

«بەندێ» ژ ستەنبولێ تێتە جولەمێرگێ‌و ژوێرێ بو ئامێدیێ . بەحسێ ئامێدیێ دکەت دبێژیت : « ئەڤ بازێرە مینا سێنیکەکا بچویکە ل سەر چیایەکی ، دەوار بکوتەکی ل ڕێکا بازێری دچیت ، دەوارێت مە چەند جارا تەحسین مەگوت چون ! ئامێدیێ بازێرەکێ کاڤل بو ، جهێ بەرکێت توێیت ئوسمالیا ل هەمی ئاڤاهی‌و کولانێت بازێری ددیاربون .

پشتی هینگێ تێت ، بەحسێ ڤێی‌و چاندنێ دکەت ، بەحسێ خەلکێ ئامێدیێ‌و کاروبارێ وان‌و بازارێ بازێری‌و ژنکێ دکەت . دچیت هەڤبینینەکێ ل گەل قایمقامێ بازێری دکەت‌و ئامێدیێ بجیهـ دهێلیت بو «ئەرەدنا» و «داودیێ»و «کورێت گاڤانا»و ژوێرێ بو دهوکێ ، درێکی‌دا چ دیتیە بەحسی ژێ کریە . «هنری بەندێ» شەڤەکی‌ما ل دهوکێ ئەو

هەڤالێت خو ئەوێت ل گەل ل «خانێ» دنڤن د پەرتوکا خوەدا بەحسێ دهوکێ‌و خەلکێ دهوکێ کریە . هەتا ڤێرێ‌و د . یوسفێ موحازەرا خوە ب کوتایێ ئانی‌و دەرفەت بو دان‌و ستاندنێ ڤەبوو برادەرێت زێری پشکداری‌کرن :

● انور محمد طاهر : مە دڤیا مە ئارمانجێت ڤێ گەریانێ زانیبان . . د ئابینی‌نە ، د ئستیعمارینە ، باوەرنەکە بێ ڤالا بیت ، کەسێ ، چ لایا پال نەدابیت .

– خەلکی دەڤەرێ ب درندەیێ سالوخ‌دایە ، لەوما وەرگێرانا پەرتوکێ پێتڤی پەراوێزایە .

– مە حەزدکر هێژایی دکتور بو مە بەحسێ (سیمونی) کربا ، کیەو ژکیرێ هاتیە بویە وەرگێرێ بەندێ ؟ .

● د . یوسف حبی : سیمون خەلکێ جولەمێرگێ‌بو ، ترکی‌و فرەنسی‌و فەلانی دزانی ، یا ژمنڤە دێ ناڤێ وی «شمعون» بیت ، هەما هندە ئەم چو دی ژێ نزانین . بەحسێ پەراوێزا هات ، من نێزیکی(٢٠٠) پەراوێزو تەعلیقاتا بو پەرتوکێ دانانە . بو ئەمانەتا عیلمی ، هەمی تشت وەکی وی گوتین من وەرگێرانە ، من چو ژێ ب پشت گوهڤە نەهاڤێتیە دژوین تێ نەبن ! ئارمانجێت گەریانێ نەدئابینە ، بەندێ نە مروڤەکێ ئابینی‌یە ، من مەوسوعا (لاروس)ی سەرك‌و بنك‌کر بەحسێ (بەندێ) ل چو ئەردا نەکریە . وەزارەتا پەروەردەییا فرەنسی هنارتبو بو کارەکی جیوگرافی‌و شوینواری ژ بەرکو کوردستان لبەر وان دەڤەرەکا دائێخستی بو چو ژێ نەدزانین .

خالد حسین : نەتنێ (بەندێ) هاتیە دەڤەرێ (بیانکی) ژی هاتیە ، خوزیکا دکتوری بیرو رائێت هەردوکا تێکەل کربان دامفا بەرفرەهتربیت .

د . یوسف : (بیانکی) بەری بەندێ ب ٣٠ سالا بو مەبەستەکا سیاسی هاتیە دەڤەرێ ، بیانکی هندەك کارو بارێت سیاسی یێت بی‌قام گرنگ ل سەر دەڤەرێ دپەرتوکا خوەدا تومارکرینە .

● پرسیار : دکتور ب رایا تە ئەگەرێت هشکی‌و رەڤیا شێوێ بەندێ ل سەر خەلکێ دەڤەرێ چنە ؟

د . یوسف : مروڤەکێ هشك‌و رەق وەکی بەندێ من نەدیتیە ، بێ واس‌بو لێ نە دهەمی بیرو رائێت خوەدا . هندە ئەگەرێت ڤێ چەندێ دڤرنە :

– دفن بلندیا وی وەکو بیانیەکێ فرەنسی .

– ژ هندەك دوژا ل دەڤەرێ بێ نەرازی‌بو ، ل دەمێ کو پەسنێت گەلەك دوژا ژێ کریە .

– جارنا میریا ئوسمانی گونەهبار دکەت کو ئەون ئەگەرا پاشڤەمانا دەڤەرێ .

– بەندێ رەوشت‌و تیتالێت مە ب ساناهی وەرناگریت .

ئەڤ‌و پشتی هژمارەکا دی‌یا پرسیارا هاتیە کرن‌و بەرسڤ لسەر هاتیە دان کوڕ بکوتایی هات‌و نێزیکی سەعەت‌و نیڤا کێشا .

## «ئێڤاریەکا خاندنێن شعری»

بهەلکەڤتنا روژا شەهیدی‌و بچاڤدێریا هێژا عبدالسلام‌العناز جێگرێ رازگرێ نهێنی یێ سەرکردایەتیا تایێ دهوکێ یێ پارتا بەعسا عەرەبیا هەڤپشکی ، دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی ل دهوکێ میهرەجانەك بو هوزانڤانێت گەنج سازکر ل روژا سێ‌شەمبێ رێکەفتی ١٩٨٦/١٢/٢ ل هولا بزاڤێت فێرگەها . هژمارەکا تورەڤان‌و رەوشەنبیرا ل ڤێ میهرەجانێ ئامادەبون .

هوزانڤانێ هێژا صدیق شروی هوزانڤانێت پشکدار پێش‌کێش کرن . ئەڤێت زێری ئەو هوزانڤانن ئەڤێت پشکداری دڤێ میهرەجانێ‌دا کرین‌و هەلبەست ب‌ڤێ هەلکەفتنێ خاندین :

١ – مقداد مردان ٢ – علي مصطفی صالح
٣ – عبدالستار حسن ردێنی ٤ – نصرالدین هادي
٥ – سفر شعبان ٦ – حازم جاسم ٧ – اسماعیل زاخویی ٨ – عمر محمد عامر .

ئەڤەو سەرکردایەتیا تایێ دهوکێ یێ پارتێ هوزانڤانێت

پشکدار خەلات کرن .

**«کورەك‌و شەش ڤەکولین ل سەر رەخنێ»**

بەلکەفتنا رۆژا شەهیدی ، ژ چالاکییێت ریڤەبەریا رەوشەنبیری جەماوەر ل دهوکێ ، خەلەکەکا ڤەکولینا دەربارەی رەخنا تورێ کوردی ل رۆژێت ٣-٤-٥/١٢/٩٨٦ ل هولا بزاڤێت فێرگەها هاتە پێش‌کێش کرن . هژمارەکا باش یا رەوشەنبیرو تورەڤانێت پارێزگەهێ ئامادەبون .

ل‌رۆژا چوار شەمبێ ١٩٨٦/١٢/٣ ل سەعەت چواری ئیڤارێ روینشتنا یەکێ ژڤێ خەلکێ دەست پێکر ، هێژا صدیق شرو ریڤەبەریا وێ‌کر . ڤەکولینا یەکێ دڤێ روینشتنێ‌دا یا سەیدایێ هێژا محمدامین عثمانی‌بو بناڤێ «رەخنا تورەیی ل دەڤ تورەڤانێت پارێزگەهێ» . ژرێڤە سەیدای دەست پێکرنێت رەخنێ دتورێ کوردی‌دا بەحسی ژێ‌کرو بیستەکا خوش ل‌سەر رەخنێ دفولکلوری‌دا ئاخفت .

ددویڤدا هاتە سەر بەحسێ پێکول‌و پویتە پێکرنا خوەو چەند هەڤالەکا ل بەهدینا دپاناڤا رەخنێ‌و رەخنە نڤیسینێ‌دا . سەیدای گوت : «بەرێ رەخنە یازڤرو بێ‌سەلیقە بو» . پاش هات ل سەر رەخنا ئەڤرو ئاخفت .

ڤەکولینا دی دڤێ روینشتنێ‌دا یا هێژا انورمحمدطاهری بو بناڤێ « نوی‌خازی‌و چەند رایەك دەربارەی هوزانێ» .

ل پێشیێ پەژنو رامان ژ نوی خازێی ل دوی بیروراێت چەند زاناو شارەزاێت عەرەب‌و بیانی پێش‌چاڤ کرن . سەیدایێ انور بابەتێ خوە ل‌سەر خالێت ژێری پارڤەکرن :

- سیماو تایبەتییێت نوی‌خازیێ : ژوان سیما ئالوزی‌و رەمزو دویر بینیا تێدا . موحازر بدرێژی ل‌سەر ڤان ئالا ئاخفت پاشی بیستەکا خوەش ل دەڤ خالێت ژێری راوستیا :
- زمانێ هوزانا نوی‌خاز .
- بکار ئینانا ئەفسانێ دهوزانا نوی‌خازدا .
- وێنە دهوزانا نوی‌خازدا .

ددویڤدا هژمارەکا برادەرا کەتنە دان‌و ستاندنێ ل‌گەل هەردوو موحازرا ژوان :

- نجیب صالح بالایی : ژناڤ‌و نیشانێت ڤەکولینا سەیدا محمدامین عثمانی مە وسا هزر دکر دێ بومە بەحسێ تورەڤانێت پارێزگەهێ‌کەت . دیسا ناڤ‌و نیشانێت ڤەکولینا کاك انوری ێ ژناڤەروکێ دویر بو . پێتڤی بو بەحسێ نوی‌خازیێ د شعرا کوردی‌دا کربا ، بەحسێ روانکێ کربا . (حداثه – تجدد – معاصره) ئەڤ هەرسێکە ژێك ڤاڤارتبان .

- صلاح شوان : دیتنا خو ب کورتی ل‌سەر نوی‌خازیێ رون‌کر .

جودایی بەلێ یا دناڤبەرا (حداثه – تجدد – معاصره)دا هەی .

دیسان هەر سەردەمەکی نوی خازیا خوە یا هەی . نوی خازی دیتنەکا نوی‌یە بو جیهانێ .

- عبدالکریم فندی : مە دڤیا هاتبا رون‌کرن کا رەخنەگرێ دهوکێ چاوا رەخنێ دنڤیسیت . سەیدای گوت گەنجێت مە ب ئەزمانەکێ شەپلی دنڤیسن ، مە دڤیا هندەك نمونا بینیت پێت شاعراو چیروك نڤیسا . دیسان وەکو موستەلەح ئەو نوی‌خازی جهێ خو ناگریت ، ئەو بخو دبیتە (نویاتی) .

ل روینشتنا رۆژا پێنج شەمبێ رێکەفتی ١٩٨٦/١٢/٤ دو ڤەکولینێت دی هاتنە خاندن ژلایێ تیلی امین‌و عبدالکریم فندی‌ڤە ، محسن قوچانێ شاعر ئەڤ روینشتنە برێڤەبر .

«ئەفسانە د شعرا کوردی‌دا» ڤەکولینا سەیدایێ تیلی بو .

ل پێشیێ بشێوەکێ گشتی ل سەر ئەفسانێ‌و رەمزێت ئەفسانەیی پێت کوردی ئاخفت . بەحسێ شاعرێت عەرەب‌و بیانی کر ئەوێت بو جارا یەکێ ئەفسانە د شعرێت خوەدا بکار ئینایین .

پشتی هینگێ ب درێژی ل‌سەر ئەفسانێ‌و شاعرێت کورد ئاخفت‌و خوە بناڤ دیوانێت چەند شاعرەکادا بەردا ژوان : (عبدالرحمن مزوری – نافع ئاکرەیی – نوزاد رفعت – محسن قوچان – صلاح شوان) .

کاك تیلی‌خو یاکر کو بارا پێتر ژڤان شاعرا تنێ دەست درێژکریە رەمزێت ئەفسانەیی .

ڤەکولینا دی دڤێ روینشتنێدا یا عبدالکریم فندی‌یە ل ژێر ناڤێ (بازێر ل با هوزانڤانێت کورد) . ژرێڤە سەیدایێ عبدالکریم بو مە ل سەر هوزانڤانێت کورد بێت کە ڤن ئاخفت ، کا چاوا بەحسێ بازێری وان دهوازنێت خوەدا کریە .

دیسان بینینا هوزانڤانا بو بازێری بەری شورەشا پێشەسازیێو پشتی وێ بدرێژی هاتە پێش چاڤکرن . تایێ دێ ژبابەتی سەیدای بو مەخویا دکەت کا چاوا شاعرێت کورد بازێری دبینن ، چاوا سەح دکەتە مروڤێ بازێری ، ل ناڤ کومەلا بازێر ڤانێ چ دبینیت ؟ . بوڤان پوچونێت خوە سەیدای نمونە ژ شعرێت ڤان شاعرا ئینان : (جەگەرخوین — نالبەند — عبدالرحمن مزویری — محسن قوچان) .

پشتی خاندنا ڤەکولینا ب دوماهی هاتی هژمارەکا برادەرا تێبینیو رایێت خوە گوتن ژوان :

کریم جمیل بیانی : (ئەفسانەو داستانو ئاشوپو مێژو) هاتنە تێکەل‌کرن . بو سەیدایێ عبدالکریم فندی بازێر نەبویە (مەسروح) بو چ کریارێت هوزانێ بو هوزانڤانا ، ئەم نەشێین چ هوزانڤانێ بەحسێ بازێری کری بکەینە دناڤ بابەتیدا .

سگڤان عبدالحکیم : سەیدایێ تیلی رەمز لگەل ئەفسانێ تێکەل‌کر .

سەیدایێ عبدالکریم نزانم بوچی هوزانڤانێت گەنج هەلبژارتنو هندەك وەکی بدرخانیو خالد حسینیو نجیبی ژبیرکرن .

حجی جعفر : بابەتێ سەیدایێ تێلی هندی بێژی بەرکەتیو هێژایە گەلەك یێ سەرکەتی بو تێدا . لێ دەمێ دیوانێت شاعرا ئیناین باش‌بو گوتنا ل کیرێ بسەرکەتینە ، ل کیرێ بسەرنەکەتینە . یادی مە دڤیا کاك تێلی بومە ژێدەرێت خو گوتبان ژ بەرکو گەلەك ژێدەر ژ بابەتێ خوەرا ئینانە .

انور محمد طاهر :

کاك تیلی گەلەك (اسطورة) بەرفرەهکر . ب چ شکلا (جەمیلە بوحیرد) نابیتە اسطورة . مافێ گەلەکا خار ئەفسانە د شعرێت خوودا بکار ئینانە . جەگەرخوین گەلەکێ گەروك‌بو ، نوکە گەلەك بەحسێ بازێری کریە .

صلاح شوان : ئەز پێنگاڤا کاك تیلی ب باش دزانم ، گەلەك باش بو نمونە ژکرمانجیا ژێری ئیناین ، هیڤی دارم دکورادا ل هەڤلێرو سلێمانیێ ژی نمونا ژ کرمانجیا ژوری بین .

عبدالرحمن مزویری : قەدری جانیو ئوسمان سەبری ژی ئەفسانە هەنە ، رەخنە ڤانەکێ مصری ، یان ئەدیبەکێ کورد دبێژیت . . تڤیا ناڤێت وان بو مە گوتبان کا دا ئاخفتنێت وان پەسندکەین ، یان نەء .

عبدالکریم فندی : کاك سگڤان دبێژیت بوچی بەحسێ بدرخانیو فیصل مصطفی‌ێ نەکر ، نە هەر شاعرێ ناڤێ بازێری ئینای دێ ناڤێ وی کەمە دڤەکولینا خوەدا . دیوانا فیصلی من هەمی ڤەدا من چ ل سەر بازێری نەدیت .

تیلی امین : ژێدەرێت من ٢٦ ژێدەرن ژبلی دیوانا . کاك تیلی ل هێرە بەرسڤا برادەرا داو ناڤێت وان رەخنەگرا گوتن .

سعید یحیی : دڤیا برادەرێت مە دڤەکولینادا رایێت خو گوتبان .

روینشتنا دوماهیێ ژڤێ خەلەکێ سەعەت دەهی سپێدا ئەینی ١٩٨٦/١٢/٥ دەست پێکر سەیدا نزار محمد سعید رێڤەبەریا وێ کر .

«چەڤەنگ (رمز) دشعرا کوردی‌دا» ڤەکولینا سەیدا عبدالرحمن مزویری لپێشیێ دەست پێکرو بەحسێ چەڤەنگی بگشتی کر ، پشتی هینگێ هاتو توخمێت چەڤەنگاو ڤێرگەهێت چەڤەنگیو رێبەرو سەرکێشێت پێش‌چاڤ‌کرن . ئو بدرێژی ل سەر نیشانێت ڤێرگەها چەڤەنگی ئاخفتو مشە نمونێت هوزانا ئینان . ل دوماهیێ بدرێژی ل سەر ڤان هەردوو خالێت ژێری ژڤەکولینا خوە ئاخفت :

● چەڤەنگی دهوزانا کەڤنا کوردی‌دا .



● چەڤەنگی دهوزانا سەربەستا کوردیدا .

ددویڤدا سەیدا سگڤان عبدالحکیمی بابەتێ خو خاند ئەوێ ل بن ناڤێ «رەخنە کلیلکا شعری‌یە» ژرێڤە بدرێژی ل سەر رەخنێ ئاخفت ، پاش مەرجێت رەخنێ دەست نیشان کرن . ئەڤە هژمارەکا برادەرا بیروراێت خوە ل سەر ڤەکولینا خویاکرن ژوان : عبدالکریم فندی– صلاح شوان – محمدامین عثمان – تیلی امین – سعید یحیى – حجی جعفر – انور محمد طاهر – بائیز عمر – نجیب صالح – محسن قوچان .

**«دوو چیروک‌و رەخنە»**

ژ چالاکیێت ئێکەتیا نڤیسڤانێت کورد – تایێ دهوکێ ل رێکەفتی ١٩٨٦/١٢/١٢ کورەك هاتە سازکرن بو ئەدیبێ هێژا کریم جمیل بیانی ل هولا بزاڤێت ڤیرگەها ، هێژا محسن قوچانی کور گێرا .

دڤێ کوری‌دا دو سەیدا ، جلال مصطفى‌ی‌و صبیح محمدی چیروکێت خو خاندن‌و هێژا کریم بیانی رەخنە لێ‌گرت . چیروکا کاك جلالی بناڤێ (رەڤین)ەو یا کاك صبیح بناڤێ (بەرپەرەك ژ چیروکا(داشکەستنێ) . کاك کریمی بەحسێ هەردو چیروکا کر ژلایێ ئاشوپی‌و مونتاجی‌ڤە . پشتی بکورتی ئەڤ هەردوو لایە داینە ناسین ، رێکێت ئاشوپێ دیارکرن ئەوژی ئەڤێت .

ژێری‌نە :

١ـ ئاشوپا سادە ٢ – ئاشوپا چێکری ٣ – ئاشوپا وەکی خەونێ (وەهم) ٤ – ئاشوپا بەرهنگارکەر ٥ – ئاشوبا کارتێکەر . ددویڤدا مونتاج دا ناسین‌و ل‌سەر تەرزێت وێ ئاخفت ، ئەو ژی ئەڤەنە : ١ – مونتاجا دەمی ٢ – مونتاجا جهی . پاشی بدرێژی ل‌سەر چیروکا ئاخفت‌و لاێت تێدا ب‌سەرکەتی‌و نەسەرکەتی بو مە خویاکرن . ل دوماهیێ هژمارەکا پرسیارا هاتەکرن . بەرسڤا وان ژلایێ موحازری هاتە دان‌و کوری نێزیکی سەعەتەکی کێشا .



**«کورەك دەربارەی شعرێت د . کامیران بەدرخانی»**

«دلی کورێن من» دیوانا د . کامیران بەدرخانی ئەوا کو ل سالا ١٩٣٢ دەرکەتی ، پێداچونە ل سەر هاتە پێش‌کێش کرن ، ل ئێکەتیا نڤیسڤانێت کورد ل دهوکێ ل رێکەفتی ١٩٨٦/١٢/١٩ژلایێ هوزانڤانێ گەنج پێزانێ ئالیخانی . هێژایێ هوزانڤان نجیب بالایی کور برێڤەبر . ژرێڤە موحازری چەند خالەك ل‌سەر ژیانا د . کامیران بەردخانی رون کرن . پاشی ناڤەروکا هوزانێت ڤێ دیوانێ خویاکرن‌و مشە نمونە ل سەر ئینان ، نەمازە ل سەر خاندن‌و زانین‌و خاندنگەها . دیسان چەندەکێ ل‌سەر هوزانا دیروکی بو مە ئاخفت ، کو ناڤبری بویەرێت دیروکی ب هوزان ڤەهاندینەو دارێژتینە .

ئەڤەو ل دوماهیێ چەند پرسیار هاتنە کرن‌و بەرسڤا وان ژلایێ کەکێ موحازر هاتنە دان‌و کور تەڤاڤ بو پشتی نێزیکی سەعەتەکێ کێشای .

**ستێرەکا دی ژی رژیا**

ل سەعەت هەشت چارێکەك ل سپێدا روژا چوارشەمبێ ، رێکەفتی ١٩٨٦/١٢/١٧ دلێ سترانبێژێ کوردێ مەزنێ بناڤ‌و دەنگ محمد عارفێ جزیری راوستیا . گەشترین ستێرا ئاسمانێ سترانا کوردی رژیا . . پشتی خزمەتکرنەکا بێ بەرامبەر نێزیکی ٥٠ سالا . . بارکرو دلێ خوەیێ تەرو نازك . . سامانەکێ مەزن یێ ستران‌و ئاوازێت رەسن ژ ملەتێ خوەرا هشتن . . مال‌و مالداریا خودێ لێ‌خوش . . هەی‌و نەیێت‌وی تنێ ستران‌بون چ دی نە . . تەڤ ژیانا خوە ژ سترانارا تەرخان کر بسەر فەرازی‌و سەر بلندی کو تم جهێ شانازیا هەر لایەکی‌بو . . مرن ژمروڤێن هولێ‌را نینە هەتا هەتایی ددلێ کورێن مالەتێ خوەدا ساخەو دەنگ ل دەنگ ل دنێ تم بەلاڤە .

سلاڤ‌و هزار سلاڤ ل گورێ تەبن کەوێ روباد جهێ تە بەحەشت بیت .

رابۆرت

عەزیز رەشید حەریری

# «ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان»و چاپەمەنی کوردی لە سالی ١٩٨٦ دا

ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی کوردستان ، سالی رابردووش وەکو سالانی دیکە ، کۆمەلە کتێبێکی تری خستە بەردەست نووسەرو خوێنەرانی کوردەوە ، بەم کارەیشی تا رادەیەکی چاك ئەو بارە گرانەی کە بەکۆلی بەشێکی زۆری نووسەرانی کوردەوە بوو ، گرتی‌یە ئەستۆی خۆی‌و «٢٢» کتێبی هەمەجۆری لەسەر ئەرکی خۆی بەچاپ گەیاندو ، یارمەتی «٣٤» ئەدیب‌و نووسەری کوردیشی‌دا ، ئەلبەتە ئەم کارە پیرۆزەی ئەمینداریتی ی دەبێتە پالپشتێکی چاك بۆ زیتر بەرەوپیش‌بردنی باری رۆشنبیری کوردی‌و ، بنەمایەکی پتەوو بەسوود دەخولقێنێ بۆ دەست بەبالەوە گرتنی ئەدیب‌و نووسەرانی کورد .

ئەوەی راستی بێت ئەمینداریتی ی رۆشنبیری‌و لاوان ، وەکو دەزگایەکی رۆشنبیری لەناوچەی کوردستان‌دا هەولێکی چاکی داوە بۆ خزمەت‌کردنی ئەدەب‌و رۆشنبیری کوردی ، ئەوەتا لە سالی «١٩٨٢»وەوە تاوەکو کۆتایی سالی «١٩٨٦» توانیویەتی «٢٠٥» کتێب بخاتە سەر خەرمانەی ئەدەب‌و رۆشنبیری کوردی‌یەوە ، بەهەردوو بەشی چاپکردن‌و یارمەتی دانەوە ، بی‌گومان ئەم کارەیشی مایەی رێزلی‌گرتنەو ، رەنگدانەوەی هەول‌و کۆششی بی‌سل‌کردنەوەی ئەو کەسانەیە کە لەم چەند سالە کورتەدا ئەم ئەنجامە گەورەیان وەدەست هێناوە ، ئەمە جگە لەوەی کە لە سالانی پێشتریش چەند کتێبێکی‌تر چاپکراوەو یارمەتی‌دراوە ، بەلام لەبەر تۆمار نەکردنیان بۆمان نەکرا پەنجەیان بۆ بکێشین .

ئێستاش فەرموون ئێوەو ئەو کتێب‌و بەرهەمە کوردی‌و عەرەبی‌یانەی سالی‌پار لە چاپدراون‌و یارمەتی‌دراون‌و کەوتونەتە کتێبخانەکانەوە . ئەمە جگە لەوەی کە هەندێ کتێب سالی ١٩٨٦ بریاریان بۆ دراوە بەلام هێشتا لەچاپخانەکاندا ماونەتەوە . وەبەر رەحمەتی کێشەو تەگەرەی چاپ‌کەوتوون ، بەهەرحال لەداهاتوودا ئەوانیشتان پی دەناسێنین

**● کتێبە چاپکراوەکان ●**

**أ – کوردی‌یەکان :**

**١ – دیوانی حاجی قادری کۆیی :**

سەرەتای سالی ١٩٨٦ ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیری‌و لاوان جوانترین‌و بە بەهاترین دیاری ئەدەبی ی پێش‌کەش بەئەدیب‌و ئەدەب دۆستانی کورد کرد ، کە ئەویش دیوانە بەنرخەکەی شاعیری کوردی نەمر «حاجی قادری کۆیی» بوو . .

ئەم دیوانە لەلایەن مامۆستایان کەریم شارەزاو سەردار حمید میران ، لی‌ی کۆلراوەتەوەو لێکدراوەتەوە ، مامۆستا «مسعود محمد»یش پێیداچۆتەوە ، دەتوانین بلێین ئەم دیوانەی شاعیر سەرجەمی هەموو دیوانە چاپکراوەکانیتی‌و زۆربەی هەموو شیعرەکانی تێدا کۆکراوەتەوە . بۆ ئامادەکردنیشی سوود لە کۆمەلە سەرچاوەیەکی کوردی‌و عەرەبی‌و فارسی وەرگیراوە ، لە لاپەرە «٢٩١ ، ٢٩٢»دا کاکە محمدی مەلا کەریم کە سەرپەرشتکاری دیوانەکەبووە لەژێر ناونیشانی «دوا وشەی

منیش»دا ، ئەوەی روون کردۆتەوە کە چۆن ئەرکی سەرپەشتی کردنەکەی پی‌سپێردراوەو شیعرەکانی نێو دیوانەکەی لەگەڵ ئەو سەرچاوانەدا بەراورد کردووە کە لای خۆیەتی . بەمەش توانیویەتی بەشێکی ئەو کەم‌و کورتیانە چارەسەر بکا کە لە لێکۆڵینەوەکەدا وەبەرچاوی کەوتوون ، ئەمە سەرەڕای تی‌هەڵکێش کردنی هەندێ پەراوێزی خۆی .

ئەم دیوانەی حاجی بریتی‌یە لە «٢٠٤» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣×٥ر١٥سم»و ، لە چاپخانەی «افاق عربية» لە چاپ دراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارە «٧٥»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخەکەیشی یەك دینارو نیوەو ، شەش هەزار دانەی لی‌چاپ کراوە . .

کاك «محمدی مەلا کەریم» سەرپەرشتی لەچاپ‌دانی کردووەو «عەزیز رەشید حەریری» نەخشەی بەرگ‌و دەرهێنانی هونەریی ئەم دیوانەی ئەنجام داوە . .

**٢ – گەشتی چارەنووس :**

شانۆنامەیەکە بۆ منداڵ‌و مێرد منداڵان نووسراوەتەوە ، کاك محمود زامدار لە سیناریۆیەکی شانۆیی‌یەوە کە «قاسم محمد»ی هونەرمەند بەزمانی عەرەبی نووسیویەتی ، وەریگێڕاوە بو زمانی کوردی . .

ئەم شانۆنامەیە لە بنچینەدا بەزمانی فەرەنسی نووسراوەتەوەو ، نووسەرەکەیشی وەکو وەرگێڕ روونی کردۆتە فرۆکەوانێکی رۆژنامەنووس بووە کە لە ساڵی «١٩٤٤»دا بەفرۆکەکەی بۆ راپەڕاندنی کارێك دەچێت‌و ، ئیتر ناگەڕێتەوە ، ئەو فرۆکەوانەیش ناوی «ئەنتوان ماری رۆژێ دینت – ئاکزو پێری» بووە ، لەساڵی «١٩٠٠»دا ، لە شاری «لیۆن»ی فەرەنسا لەدایك بووە .

ئەم شانۆنامەیە بریتی‌یە لە «٨٨» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٢×٥ر١٦سم»و ، لەچاپخانەی ئەمینداریێتی‌ی رۆشنبیریی‌و لاوان لەهەولێر لەچاپ دراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارە «١٤٧٣»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخەکەیشی «٢٥٠» فلسەو سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

وەرگێڕ هەر، خۆی سەرپەشتی‌ی لەچاپ‌دانی کردووەو ، بەرهەمەکەیشی پێش‌کەش بە «راستی‌و کاروان‌و ڤیان» کردووە .

**٣ – هەڵبەستێن بژارتە :**

کۆمەڵە هەڵبەستێکی هەڵبژاردەی شاعیری ناسراوی سۆڤیەتی «میخائیل یووریۆڤیچ لێرمۆنتۆف»ە ، نووسەری هێژا «د . حسێن رەهبەر ڕێزان» لە زمانی رووسی‌یەوە وەری‌گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی‌و ، «د . تۆسنی رەشیدو ، د . عبدالله پەشێو» بەکوردی‌و رووسیەکەدا چوونەتەوەو بەراوردیان کردووە .

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «٨٠» لاپەرەی قەبارە ناوەنجی «٢١×٥ر١٣سم»و ، لە چاپخانەی «علاء» لەبەغدا لەچاپ‌دراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٥٥٩»ی ساڵی ١٩٨٥ی دراوەتی‌و ، نرخەکەیشی «٣٥٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

کاك «محمدی مەلا کەریم»یش ئەرکە هونەری‌یەکانی بەچاپ گەیاندنی ئەم کتێبەی لەئەستۆ گرتووە ، ئەم کتێبەیش ئەگەرچی مێژووی ساڵی ١٩٨٥ی لەسەرەو ، ژمارەی سپاردنیشی هەر ساڵی (١٩٨٥)ە ، بەڵام چاپەکەی دواکەوتووەو ، سەرەتای ساڵی ١٩٨٦ کەوتۆتە کتێبخانەکانەوە .

**٤ – نووسینی کوردی :**

مامۆستای دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف بەردەوام کەوتۆتە شوێن بژاندنەوەو خزمەت کردنی زمانی کوردی ، ئەویش لەرێگەی ئەو کتێب‌و چاپکراوانەی کە پەیتا پەیتا دەیان خاتە بەردەستی رۆشنبیرو خوێندەوارانی کوردەوە ، ئەوەتا وا ساڵی ١٩٨٦ ، بەرهەمێکی دیکەی خستە کتێبخانەکانەوە بەناوی «نووسینی کوردی بە ئەلفو بێی عەرەبی» ، ئەم کتێبەی دوکتۆر بریتی‌یە لەکۆمەڵە بابەتێکی بەپێزو بەسوود دەربارەی نووسینی کوردی کە جگە لە پێشەکی نووسەر ئەم بابەتە سەرەکی‌یانەی گرتۆتەوە :

**«نووسین‌و جۆرەکانی‌و مێژووی ، کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، گیروگرفتی نیگاری دەنگەکان ، گیروگرفتی نووسینی وشەکان‌و تێك بەستنیان» هەروەها چەند بەشێکی دیکە کە لە هەموویان بەسوود تر بۆ نووسەران ئەو بابەتەیە کە لەبارەی خاڵبەندی‌یەوەیە .**

دوکتۆر ئەورەحمان بۆ وەبەرهەم هێنانی ئەم کتێبەی سوودی لە «٢٤٤» سەرچاوەی هەمەجۆر وەرگرتووە ، ئەڵبەتە ئەم کارەیش بەهاسانی ئەنجام نەدراوە ، بەڵکو ماندوبوون‌و شوێن‌کەوتنێکی زۆری تێ‌چووە .

ئەم کتێبەی دوکتۆر «١٩٠» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٤×١٧سم»و ، لەچاپخانەی «علاء» لەبەغدا چاپ‌کراوە ، لەنامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٣٤»ی ساڵی ١٩٨٦ی

دراوەتیٚو ، نرخەکەیشی «٧٥٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لیٚ چاپکراوە .

دەرهێنانە هونەرییەکەی «عەزیز رەشید حەریری» ئەنجامی داوەو ، کاك «جەعفەر بەرزەنجی»ش سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە . .

**٥ – مەرکانەی کوردی بۆ گوڵی بوردی :**

لە زنجیرەی بڵاوکراوە ئایینییەکاندا ئەمساڵ چەند کتێبێك کەوتنە کتێبخانەکانەوە ، لەوانەیش نامێلکەی کوردی بۆ گوڵی بوردی کە مامۆستا طاهر مەلا عبدالله بەحرکەیی لەعەرەبییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ، ئەم نامێلکەیە لەلایەن مامۆستا «عبدالکریم المدرس» پەسند کراوەو ، بەکارێکی چاك لەقەڵەم دراوە . نامێلکەکە بریتییە لە «دە» بەشی جیاجیا کە لەتەك وەرگێڕانەکەدا عەرەبییەکەیشی نووسیوەتەوە . .

مەرکانەی کوردی «٤٨» لاپەڕەی قەبارەی گەورەی «٢٢×١٦،٥سم»و . لە چاپخانەی ڕۆشنبیریو لاوان لە هەولێر لە چاپ دراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٥٣٠»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚو . نرخەکەیشی «٢٥٠» فلسەو . «٢٠٠٠» دانەی لیٚ چاپکراوەو ، بەخەتی دەستیش نووسراوەتەوە .

**٦ – محمد عارفیٚ جزیری کەویٚ رِبادە :**

محمد عارفیٚ جزیری ئەو هونەرمەندە کوردەدەنگ خۆشە بوو کە لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان شوێنی شیاوو دیاری خۆی هەبوو . خاوەنی بەهرەیەکی گەورەو لەبن نەهاتوو بوو . ئەو مرۆڤە دڵسۆزە بوو کە بەو پەڕی وەفاداریو دڵسۆزییەوە مامڵەتی لەگەڵ گۆرانی کوردی رەسەندا کرد .

ئەم کتێبەی کاك سگڤان بریتییە لە «١٠٢» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٢×١٥،٥سم»و ، لەچاپخانەی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان لەهەولێر لەچاپ دراوە . لەنامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٥٩١»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚو ، نرخی دانەیەکی «٧٥٠» فلسەو ، دوو هەزار دانەی لیٚ چاپ کراوە .

کاك نەزار بەزاز نەخشەی بەرگەکەی کردووەو . کاك «سەرهەنگ محمد سعدالله»ش سەرپەرشتیی لەچاپدانی کتێبەکەی کردووە . بۆ زێدە ئاگاداریش ئەم چاپکراوە بە شێوە زمانی کرمانجیی ژووروووەو . جگە لەچەند کورتە باسێك کە لەپێشەکیدا هاتووە «٢٧» گۆرانیی هەمەجۆری محمد عارفی جزیری تێدا بڵاوکراوەتەوە .

**٧ هەڵبەستەکانم :**

ئەم چاپکراوەیەیش بریتییە لە دیوانێکی هەڵبەستەکانی مامۆستا «علي ناجي عطار» کە نزیکەی «٤٦» پارچە شیعری گرتۆتە خۆ . کە زۆر لایەنی نیشتمان پەروەریو جوانیو جوانیی وولاتو بەهارو کوردستانو ئایینیو ڕێنمایی کردنو پەروەردەیی دەردەبڕن . ئەمە جگە لە ناساندنێکی خێرای شاعیر کە لەدوا لاپەڕەدا هاتووە .

ئەم چاپکراوەیش هەر دیسان لەسەر ئەرکی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستان لەچاپ دراوەو . بریتییە لە «١١٨» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٠×١٤سم»و . لەچاپخانەی ڕۆشنبیریو لاوان لەهەولێر لەچاپ دراوە . لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٥٢٦»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚو . نرخەکەیشی «٣٥٠» فلسە ، کاك سیروانی بەکر سامی نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو ، سەرپەرشتیی چاپکردنیشی کردووەو . دوو هەزار دانەی لیٚ چاپکراوە .

**٨ تەجویدی قورئان :**

مامۆستا «مسعود مەلا عبداللەی بیٚبەش» لەساڵانی زووەوە چاپیی یەکەمی ئەم بەرهەمەی خۆی بڵاوکردۆتەوەو تا ڕادەیەکی باش لە بواری تەجویدی قورئان سوودی بەو کەسانە گەیاندووە کە مەبەستیانەو مەبەستیان بووە لەم زانیارییەدا شارەزا بن . هەر لەم ڕوانگەیەشەوە . وا لە ساڵی ١٩٨٦دا چاپیی دووەمیشی وەکو دیارییەکی خنجیلانە پێشکەش بەوانە کردەوە کە لەچاپیی یەکەمی تەجویدی «بیٚبەش» بیٚبەش بووبوون .

تەجویدی قورئان «٣٢» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣×١٦سم»و . لە چاپخانەی ڕۆشنبیریو لاوان لە هەولێر لەچاپ دراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٩٨١»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیو . «٢٠٠٠» دانەی لیٚ چاپکراوەو . نرخەکەیشی «٢٠٠» فلسە .

ئەم نامێلکەیەش هەر بەخەتی دەست نووسراوەتەوە لەلایەن کاك «سعید یحیی خطاط»ەوەو . بە ئۆفسێت چاپکراوە .

**٩ – عیراقا خۆشتێ :**

ئەم چاپکراوە بریتییە لە کۆمەڵە شیعرێکی سیاسیو نیشتمانیی برای شاعیر خالد حسین . کە بەخەتی دەست نووسراونەتەوە . شاعیر ئەم

بەرهەمەی پێشکەش کردووە بە هەموو مێرخاس و پاڵەوانێکی کە بۆتە چەپەرو بەرسنگی دوژمنی گرتووە تاوەکو وولاتە شیرینەکەمان ناشیرین نەکات .

ئەم چاپکراوە «٤٨» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٠×٥ر١٤سم»و . لە چاپخانەی ڕۆشنبیری سەر بە ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوان لە هەولێر لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١١٠٨»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و . ترخی «٣٠٠» فلسەو ، «٢٠٠٠» دانەی لێ چاپکراوە ، ئەوەی شایانی باسە شاعیر هەر ئەم ساڵ واتە ساڵی ١٩٨٦ دیوانێکی تری بلاوکردۆتەوە بەیارمەتی ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیریی و لاوان . بەناوی پێلا سێ .

**١٠ – ملوانکەی ئەڵماس** :

کۆمەڵە چیرۆکێکی چیرۆك نووسی بەناوبانك «گی . دی . مۆپاسان»ە ، مامۆستا علی فتاح دزەیی لە زمانی ئینگلیزییەوە کردوونی بە کوردی ، وەرگێر پێشـەکییەکی بەچوار لاپەڕە بۆ کتێبەکە نووسیوەو ، پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە زۆر لەمێژە خەریکی ئەم پرۆژەیە بووە کە بریتییە لە وەرگێرانی شازدە کورتە چیرۆکی مۆپاسان . وە بە تایبەتی بەناوبانگترین کورتە چیرۆکەکانی . هەروەها ئەوەی ڕاگەیاندووە کە چیرۆکەکانی ئەم نووسەرە وەرگێردراونەتە سەر زووربەی زمانەکانی ئەوروپایی و زمانانی دیکەو – ناوە ناوەش کراون بە کوردی – ئیتر هەر لەبەر گرینگی چیرۆکەکانی ئەم نووسەرە وەرگێر دەڵێ :

«زمانی کوردیش ، کەمو زۆر لەمە بێبەش نەبووە . ڕەنگە بێ بۆ یەکەمین جار . لاپەڕەکانی «گۆڤاری گەلاوێژ» ئەم نووسەرەی بە کورد ناساندبێ . دوای ئەویش چاپەمەنییەکانی کوردی . ناو بەناو چیرۆکێکی بلاوکردۆتەوە . بەلام . ئەوە یەکەمین جارە کۆمەڵە چیرۆکێکی ئەم نووسەرە . بەم قەوارەوە دەکرێن بە کوردیو لەنێو دوو بەرگی کتێبێکی سەربەخۆدا کۆ دەکرێنەوە» .

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم کارەی کاك عەلی شتێکی بەسوودەو . بە زمانێکی تەڕو پاراویشەوە وەرگێردراون . بەلام ئەوەی جێگەی داخە لە چیرۆکی «چۆن نیشانەی شەرەفی وەرگرت» کە لە لاپەڕە «٢٧»دا دەست پێ دەکاتو . بەپێزترین چیرۆکی نێو کۆمەڵەکەیە . چوار لاپەڕەی تەواوی لەکاتی لەچاپداندا کەوتووە . چوار لاپەڕەکەیش دەکەوێتە دوای دێری هەژدەی لاپەڕە «٣٣» . ئەڵبەتە ئەم کارەیش چیرۆکەکەی بە ناکامڵی هێناوەتە پێشەوە .

ملوانکەی ئەڵماس «٢٦٤» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «١٧×٢٤سم»و ، لە چاپخانەی «علاء» لە بەغدا لەچاپدراوە . لەنامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٨٨٣»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و ، نرخی دینارو نیوێکەو . سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە . . کاك جەعفەر بەرزنجیش سەرپەرشتی لەچاپدانی ئەم کتێبەی کردووە .

**١١ – بەرهەمی کوردەواری** :

ئەم کتێبە پێنج بەرهەمی سروشتیی ژیانی چەوساوەکانی کوردستانە لەلایەن مامۆستا «مەولوود بێخاڵی»یەوە کۆکراوەتەوەو ئامادەکراوە . بەرهەمەکانیش ئەمانەن : «**تووتن . چەند لاپەڕەیەکی تریش لەبارەی تریێ و بەرهەمەکانییەوە لە کوردستاندا . گۆزیی و کەتیرە . بەرچاوخستنی ژیانی کرێکارانی قورکاری بەر لە شۆڕشی «١٤»ی گەلاوێژی ١٩٥٨دا . هەڵوێستێکی کورت لە ژیانی ڕابردووی جوتیارانی ناوچەی هەولێر**» . ئەوەی ڕاستی بێ بێخاڵی دەمێکە خەریکی کۆکردنەوەی ئەم جۆرە بابەتانەیە . بەلام لەم یەك دوو ساڵەی دواییدا دەستی داوەتە بلاوکردنەوەیان لە گۆڤارە کوردییەکاندا ، وەکو : کاروانو ، ڕۆشنبیریی . نوێ و . ئۆتۆنۆمی . .

بەرهەمی کوردەواری ، «١٤٤» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢١×١٦سم»و ، لە چاپخانەی ڕۆشنبیریی و لاوان لە هەولێردا لە چاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٩٨٢»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و ، نرخی «٧٥٠» فلسەو . دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە ، کاك «سرهند حمد سعدالله»ش . سەرپەرشتیی لە چاپدانی کردووە .

ئەگەرچی ئەم کتێبە لەسەر بەرگی دواوەی‌و . لە لاپەڕە «١٤٤»دا بەزمانی عەرەبی نووسراوە ، بە یارمەتی ئەمینداریێتی ڕوشنبیریی و لاوان چاپکراوە ، بەلام ڕاستییەکەی . لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتییەوە . ئەوی تریان بە هەڵە نووسراوە .

**١٢ – لێك ترازان** :

کۆمەڵە چیرۆکێکی کاك «صلاح عمر»ی چیرۆك نووسەو . لە بەرگێکی قەشەنگدا کۆکراونەتەوە ، ئەم چاپکراوە «نۆ» کورتە چیرۆکی بەپێزی گرتۆتە خۆ کە ئەمانەن :

«**ئەمو ئەو ، تەرم ، کلۆڵ ، رق ، هەگبەی پیاوێکی پیر ، نهێنی ، سەفەر ، دەمامك ، چەند تابلۆێك**» .

ئەم چاپکراوە «١٨٤» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢×١٦سم»و ،

لە چاپخانەی رووشنبیری‌و لاوان لە هەولێردا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١١١٠»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ‌و ، نرخی یەك دینارەو ، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

کاك «فاضل علی» سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووەو ، کاك سەردار سنجاوی هونەرمەندیش وێنەی بەرگەکەی بۆ کردووەو ، کاك فەرسەتیش ناونیشانی چیرۆکەکانی نووسیوەتەوە . .

**١٣ – پێتۆڵی دانانی ڕەوای ئیسلامی :**

ئەم کتێبەیش یەکێکە لەو چاپکراوە ئایینیانەی ساڵی ١٩٨٦ کەوتۆتە کتێبخانەکانی کوردستانەوە ، ئەم کتێبە د . صبحی محمسانی بەزمانی عەرەبی دایناوەو ، ساڵی ١٩٤٦ لە بەیروت چاپکراوەو ، بریتی‌یە لە سەرەتایەك بۆ لێکۆڵینەوەی شەریعەتی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی مەزهەبە جیاوازەکانی‌و یاسا تازەکاندا ، مامۆستا ابراهیم عمر بە لابردن‌و زێدەکردنێکی کەمەوە ، وەری گێڕاوە . .

ئەم کتێبە «١٨٠» لاپەرەی قەبارە ناوەنجی «٢١×٥ر١٥سم»و ، لە چاپخانەی «سۆمر» لە بەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٣١٧»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ‌و ، نرخی یەك دینارەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە ، کاك «سیروانی بەکر سامی» سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووەو ، نەخشەی بەرگەکەی بۆ کێشاوە .

**١٤ – دیوانا مەلان :**

کتێبێکی بەنرخی فۆلکلۆری‌یە ، بەری ڕەنجی هەشت ساڵی ماندووبوون‌و ئازار چەشتنە بەدوای سەرچاوەو لێکۆڵینەوەدا ، ئەوەتا کۆکەرەوەو لێکۆڵەرەوەی ئەم کتێبە مامۆستا محمدأمین ئوسمان «محمدامین عثمان» لە پێشەکی‌یەکەی‌دا دەڵێ : «ئەڤ کتێبە یا د دەستێ خویندەڤانادا کومەکا بەیتانە . پێکهاتییە ژ سێ هۆزانا کلاسیکی :

**١ – مولود نامە ، ٢ – بەیتا سیسەبانێ ، ٣ – زەمبیل فرۆش .**

و دوو بەیتێت فولکلۆری :

**١ – بەیتا هەسپێ ڕەش ، ٢ – زەمبیل فرۆش» .**

بەراستی مامۆستا «محمدامین عثمان» بە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە فۆلکلۆری‌یە کارێکی پیرۆزی ئەنجامداوە .

ئەم بەرهەمەی نووسەر «٢٧٦» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٤×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی «الزمان» لە بەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٦٨٧»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ‌و ، نرخی «دوو دینارو ٧٠٠ فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە ، ئەوەی شیاوی باسکردنە کتێبەکە بەشێوە زمانی کرمانجی‌ی سەروو نووسراوەتەوە .

**١٥ – ژیان‌و ڤیان :**

بەرهەمێکی تری مامۆستا «ئەمینێ ئوسمان – محمدأمین عثمان»ە ، کە بریتی‌یە لە کۆمەڵە دەقێکی فۆلکلۆری کوردەواری وەکو ئەو گۆرانی‌یە کوردی‌یە بڵاوانەی لەکاتی بووك گوێزانەوەو ، بۆنە کۆمەڵایەتی‌یەکانی دیکەدا دەگوترێن ، هەروەها گۆرانی شایی‌و هەڵپەرکێ‌و ئەو هەنگاوانەی پێ‌یدا ڕەت دەبێ لەگەڵ ئاوازەکانی‌و ، گۆرانی‌یەکانی جوتیاران لەگەڵ وێنەی تایبەت بە بەرهەمەکە ، ئەمە جگە لەوەی کە کۆکەرەوەی ژیان‌و ڤیان لە پێشەکی‌دا باسی دوو بەیت‌زان‌و گۆرانی‌ی زانی فۆلکلۆری دەکات کە ئەمانەن : «سەلمانە کور ، حەمکی کورێ ئامێدی» .

ئەم کتێبەیش کە مامۆستا «ئەمینێ ئوسمان» کۆی‌کردۆتەوەو پێشکەشی کردووە ، بریتی‌یە لە «٢٢٤» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی «الزمان» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٧١٨»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ‌و ، نرخی دینارو نیوێکەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

نووسەر لە کۆتایی کتێبەکەدا نۆتەی «٦١» گۆرانی هەمەجۆری بڵاوکردۆتەوە ، ئەڵبەتە ئەم کارەیش ئەرکی ئەو کەسانە هاسانتر دەکات کە لەو جۆرە گۆرانی‌یانە دەکۆڵنەوە ، نۆتەکانیش هونەرمەند «سمیر زاخۆیی» نووسیونی‌یەتەوەو ، ئامادەی کردوون . ئەم کتێبەیش هەر دیسان بە شێوە زمانی کرمانجی‌ی سەروو نووسراوەتەوە .

**ب – کتێبە عەرەبی‌یەکان :**

هەر لە بواری چاپکردنی کتێب‌دا ئەمینداریێتی‌ی ئەم کتێبە عەرەبی‌یانەیشی چاپکردووە :

**١ – وجهة نظر في التفسير البشري للتأريخ :**

ئەم کتێبە لەلایەن مامۆستا مسعود محمد دانراوەو ، کاتی خۆی بەچوار بەشی جیاجیا لە ڕۆژنامەی عیراق ڕۆژانی «١٥ ، ١٦ ، ١٧ ، ١٨»ی ساڵی ١٩٨٤دا بڵاوبۆتەوە ، نووسەر لەپێشەکی کتێبەکەدا پەنجە بۆ ئەوە درێژ دەکات کە ئەو چواربەشەی ڕۆژنامەی ناوبراو بە زنجیرە بڵاوی کردەوەو هەڵەی گەورەو زەقی تێ‌کەوتبوو ، ناوەرۆکی بابەتەکەی بەتەواوی شێواندبوو ، ئەوەبوو ئەمینداریێتی‌ی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوان هاتە مەیدان‌و ئەرکی ، چاككردنەوەو بڵاوکردنەوەی هەڵەکانی

لەسەر شان لابردمو ئەم کتێبەی بە پوختەیی ئەنجامدا . .

ئەم چاپکراوەی نووسەر بریتی‌یە لە «١٢٠» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٠×١٣٫٥سم»و ، لەچاپخانەی «علاء» لەبەغدا چاپکراوە ، لەنامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٦٩٢»ی ساڵی «١٩٨٥» دراوەتیٚو نرخەکەیشی «٥٠٠» فلسەو ، «٣٠٠٠»دانەی لیٚچاپ‌کراوە . .

نەخشەی بەرگەکەی «عەزیز ڕەشید حەریری» کردوویەتی‌و کاك «جەعفەر بەرزنجی»ش سەرپەرشتیی لەچاپ‌دانی کردووە . . ئەم چاپکراوە هەرچەندە مێژووی ساڵی «١٩٨٥»ی بەسەرەوەیە بەڵام لە سەرەتای ساڵی «١٩٨٦»دا چاپکردنی تەواو بووەو کەوتۆتە کتێبخانەکانەوە .

**٢ – البدور الجلية :**

جارێکی دیکەیش بەرێز «وحيدالدين قطب‌الدين نوري بريفكاني» بەرهەمێکی دیکەی خوا لیٚخۆش‌بوو «شێخ نورالدين بريفكاني» بەچاپ گەیاندەوە دوای ئەوەی خۆی کۆی کردۆتەوەو لیٚی کۆڵیوەتەوە ، ئەم کتێبە جگە لە کورتە ناساندنێکی نووسەرو ژیانو بەناوبانگترین خەلیفەکانی‌و ، ئەو نووسین‌و بەرهەمانەی لەپاشی جێماون ، نۆ بەشی سەرەکی‌ی دیکەشی گرتۆتەوە ، کە هەندیٚ لەو بەشانەیش چەند لق جیا جیای لیٚبۆتەوە دەربارەی ئایین‌و خواپەرستی‌و شەرع‌و ڕێنمایی کردنی موسلمانان .

ئەم چاپکراوە «٤١٦» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣×١٦٫٥سم)و ، لەچاپخانەی ڕۆشنبیری‌و لاوان چاپکراوە ، لەنامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٥٢٥»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚو ، نرخەکەی «٢٫٥» دینارەو ، «٢٠٠٠» دانەی لیٚ چاپکراوەو ، کاك «سرهند محمد سعدالله»یش ، سەرپەرشتی‌ی چاپکردنی کردووە .

**٣ – ملحمة الأخوة :**

بەرهەمی ئەمجارەی کاك «عبدالله عباس» بریتی‌یە لە کۆمەڵە نووسین‌و شیعرێك کە لەکاتی خۆیدا بە زمانی کوردی بڵاوی کردوونەتەوەو ، دەگەڕێنەوە بۆ دوای ساڵانی هەشتاو سەردەمی ئەو شەڕە نارەوایەی کە حوکمرانەکانی ئێران بەسەر گەلی عیراقیان داسەپاندووە .

ئەم چاپکراوەی نووسەر «٦٤» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «١٥٫٥×٢١٫٥سم»و ، لە چاپخانەی «علاء» لەبەغدا چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٢٢٢»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚو نرخەکەی «٥٠٠» فلسەو ، «٣٠٠٠» دانەی لیٚ چاپکراوە .

کاك «عبدالله عباس» خۆی سەرپەرشتیی چاپکردنی کردووەو ، کاك «شکر جاسم» نەخشەی بەرگەکەی کێشاوە .

**٤ – الهجرة من بلدان الكومنويلث :**

ئەم کتێبە نامەی ماستەری کاك «سعید عزیز دزەیی»یە ، لەبارەی زانیاری کۆمەڵایەتی ، کە لە زانکۆی ستوکهۆڵم لە وولاتی سویدەوە وەری گرتووە ، ئەم کتێبە کاتی خۆی بە زمانی ئینگلیزی نووسراوەتەوەو ، دانەر لەم ساڵانەی دواییدا وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی‌و ئەمینداریێتی‌ی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوانیش لەسەر ئەرکی خۆی بەچاپی گەیاندووە ، ئەم کتێبە لەچوار بەش پێکهاتووە ، ئەوەتا نووسەر لەبەشی یەکەمیدا ، کە ئامانجەکان ڕوون دەکاتەوە دەڵیٚ :

«ئەم باسە ڕوون‌کردنەوەو شی‌کردنەوەی سیاسەتی هەردوو حیزبە سەرەکی‌یەکەی بەریتانیا «موحافیزین‌و کرێکاران»ە ، دەربارەی کێشەی کۆچ‌کردنی ئەو کەسانەیە کە لە ڕەگەزی پێست سپی‌یەکان نین‌و ، سەر بە ڕێکخراوەی کۆمەڵەی گەلانی بەریتانیان‌و دەیانەویٚ بچنە بەریتانیا ، ئەو کێشەیەش لە ساڵی ١٩٥٠دا دەست پیٚدەکاو ، لە ساڵی ١٩٦٠دا زیاتر توند دەبیٚو پەرە دەستێنیٚ» .

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «١٠٤» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣٫٥×١٦٫٥سم»و ، لەچاپخانەی «زانکۆی موصل» چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٣٥٨»ی دراوەتیٚو ، نرخی یەك دینارەو ، «٤٠٠٠» دانەی لیٚ چاپکراوە .

کاك سەردار میران نەخشەی بەرگی کتێبەکەو سەرپەرستی‌ی چاپکردنی کردووە . ئەم کتێبەیش هەر دیسان مێژووی ساڵی «١٩٨٥»ی بەسەرەوەیە بەڵام لە ناوەڕاستی ساڵی «١٩٨٦»دا لەچاپخانە تەواو بووەو ، کەوتۆتە کتێبخانەکانەوە .

**٥ – النجم الثاقب للفجر الكاذب :**

بریتی‌یە لە کتێبێکی ئایینی کە بە زمانی عەرەبی لەلایەن بەرێز «أبي سعيد عصمة کوڕی هاشم کوڕی حسێن کوڕی نعمان» دانراوە بۆ بەرپەرچ دانەوەی هەندیٚ بیرو ڕای ئایینی کە لە کتێبێکدا بڵاوکراونەتەوە لەلایەن «عزالدين بليق» ناوێکەوەو ، چەند زاتێکی دیکەش لە ساڵی ١٩٨٤دا وەڵامیان داوەتەوە .

ئەم کتێبە «٦٤» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٥ر٢٢×١٦سم»و ، لە چاپخانەی سۆمر لە بەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی «١١٤٠»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیێ و نرخی «٥٠٠» فلسەو «٣٠٠٠» دانەی لێ چاپکراوە ، کاك «سیروان بکر سامی» سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە .

● **ئەو کتێبانەی یارمەتی دراون :**

لێرە بەدوا باسی ئەو کتێبانە دەکەین کە یارمەتی نووسەرو دانەرەکانیان دراوەو ، لە ساڵی «١٩٨٦»دا کەوتوونەتە کتێبخانەکانەوە ، بەهەردوو زمانی کوردیو عەرەبیەوە . ئەگەرچی هەندێ لەو کتێبانە مێژووی ساڵی «١٩٨٥»یان بەسەرەوەیە . بەڵام هەندێکیان ژمارەی سپاردنیان بە کتێبخانەی نیشتمانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٦و ، لەبەر کێشەو تەگەرەی چاپ کەوتوونەتە یا سەرەتای ساڵی ١٩٨٦ وەیا ناوەڕاستی ئەم ساڵە ، بەهەر حاڵ هەموو ئەو کتێبانەی لێرەدا باسیان دەکەین ساڵی ڕابردوو لە ڕاپۆرتەکەماندا باس نەکراون .

● **ج : کتێبە کوردی‌یەکان :**

**١ - خۆشناوو خۆشناوەتی :**

ئەم کتێبەی خوالێخۆشبوو «کمال خورشید میران» بریتی‌یە لە «مێژووو ، جوگرافیاو ، یاداشت» کە لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٦دا کەوتۆتە کتێبخانەکانەوە ، «سالار»ی کوری ئەرکی ئامادەکردنو پێش‌کەش کردنی گرتۆتە ئەستۆ» .

ئەم کتێبە کۆمەڵە باسێکی بەپێزی تێدایە دەربارەی ناوچەی خۆشناوەتیو هەندێ بنەماڵەی میرەکانی شەقڵاوە ، لەگەڵ کۆمەڵێ وێنەو نەخشەیەکی پەیوەندی‌دار بە ناوەڕۆکی باسەکانەوە .

خۆشناوو خۆشناوەتی بریتی‌یە لە «١١٢» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٤×١٧سم»و ، لەچاپخانەی «علاء» لەبەغدا لەچاپ دراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارە «١٧»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیێ و ، نرخیشی «٧٥٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

کاك جەعفەر بەرزنجی سەرپەرشتی لەچاپ‌دانی کردووەو . دەرهێنانە هونەری‌یەکەی لەلایەن «عەزیز ڕەشید حەریری» ئەنجام دراوە ، کاك «محمد زادە»ی خۆشنووس و نەخشە سازیش . نەخشەی بەرگەکەی بۆ کردووەو خەتەکانیشی بۆ نووسیووە .

ئەم کتێبە ئەگەرچی مێژووی ساڵی «١٩٨٥»ی بەسەرەوەیە . بەڵام لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٦ لە چاپخانە تەواو بووەو . هەر لەو ساڵەیش‌دا لەنامەخانەی نیشتمانی‌دا تۆمار کراوە .

**٢ - کەشکۆڵی گیو :**

مامۆستای خوالێخۆش‌بوو گیوی موکریانی یەکێك بووە لەو مرۆڤە دڵسۆزانەی بەهەموو توانایەکی تێکۆشاوە لەپێناو خزمەت‌کردنی ووشەو ئەدەبی کوردی‌دا ، ئەو خزمەت گوزارە نەمرە هەر لە سەرەتای تەمەنی‌یەوە تاوەکو ماڵ‌ئاوایی کردنی لەدونیای پڕ کێشەو مەینەت‌دا بێ سڵ‌کردنەوە لەکارکردن نەکەوتووەو . ووشەی شیرینی کوردی بەزۆر ناوچەی کوردستان‌دا بڵاوکردۆتەوە . ئەوەتا لە ساڵانی زووەوە وێڵ و سەرگەردانی کۆکردنەوەی ژیانو بەسەرهاتی شاعیرو نووسەرانی کورد بووە ، بۆ ئەوەی رۆژێ لەرۆژان بە چاپکراوی بڵاوی‌یان بکاتەوەو لە فەوتان رزگاریان بکات ، بەڵام ئەو ئاواتەی ئەویش وەکو زۆر کەسانی دیکە نەهاتۆتە دی ، بۆیە ئەو پرۆژەیەی بۆ ئەنجام نەدراوەو ، خستۆیەتی‌یە ئەستۆی دوکتۆر کوردستانی موکریانی تاوەکو ، وەك ئەرکێکی کچو باوکایەتیو مامۆستاو قوتابی‌یەکی دڵسۆزو بەوەفا ئەنجامی بدات .

کەشکۆڵی گیو «١٦٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٤×١٧سم»و . لە چاپخانەی «علاء» لە بەغدا چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی «٢٦٠»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیێ و ، نرخی «٨٥٠» فلسەو ، «٣٠٠٠» دانەی لێ چاپکراوە . .

کاك عبدالقادری علی مەردان کارە هونەری‌یەکانی ئەنجام داوەو . دوکتۆر کوردستان هەر خۆی سەرپەرشتی‌ی چاپکردنەکەی کردووە .

**٣ - تەصەووف چی‌یە :**

کتێبێکی گرانبەهای مامۆستا شێخ أمین شێخ علاءالدین نەقشبەندی‌یە دەربارەی تەصەووف کە ئەم لایەنە گرینگانەی گرتۆتەوە : «رێبازی نەقشبەندی لە تەصەووفدا کامە ؟ ، تەصەووف چ کارێکی کردوەتە سەر وێژەی کوردی ؟ ، تەصەووف چۆن وە لەکەیەوە هاتووە ؟ ، فەرقی فەلسەفەو تەصەووف چی‌یە ؟ ، فەرقی تەصەووفی ئیسلامی‌ی وە تەصەووفی بەر لە ئیسلام چی‌یە ؟» ئەمەو گەلێ ووردە بابەتی دیکە کە لە ژمارە نایەن .

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «٥٦٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٤×١٧سم»و ، لەچاپخانەی «دار الحرية» لە بەغدا چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی «١٦٦٤»ی ساڵی «١٩٨٥»ی دراوەتیێ و ، نرخی دانەیەکی «سێ» دینارەو ، پێنج هەزار دانەی لێ

چاپکراوە ، ئەم کتێبەیش هەردیسان ساڵی «١٩٨٦» کەوتۆتە بازار .

کاك فاتح مەلا کریم و کاك محمدی مەلا کریم سەرپەرشتیی چاپ و راست کردنەوەی هەڵە چاپی‌یەکانیان کردووەو ، کاك «عبدالقادر علی مەردانیش» کارە هونەری‌یەکانی ئەنجام داوە .

**٤ – چینی کرێکارانی عیراق :**

«چینی کرێکارانی عیراق دروست‌بوون و سەرەتای بزووتنەوەی» . وەرگێڕانێکی بەنرخی ئەو کتێبەیە کە مامۆستای مێژوونووس «دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد» بەزمانی عەرەبی دایناوەو ، کاك فوئادی مەجید میسری لەبەر گرینگی و بە بەهایی کتێبەکە کردوویەتی بە کوردی .

ئەم کتێبە جگە لە پێشەکی وەرگێڕو ، پێشەکی نووسەر چوار بەشی سەرەکیشی گرتۆتەوە دەربارەی چینی کرێکارانی عیراق ، لەگەڵ چەند پاشکۆیەکی بەکەڵك لەبارەی مێژووی چینی کرێکارانی کوردو هەندێ لە پەیرەوە ناوخۆکانی چەند کۆمەڵەیەکی کرێکاران و فەرهەنگۆکێکی خنجیلانە بۆ ووشە گرانەکان .

ئەم چاپکراوە «٢٩٢» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣ر٥×١٦ر٥سم»و ، لە چاپخانەی «دار افاق عربیە» لە بەغدا چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٦٨٠»ی ساڵی «١٩٨٥» دراوەتێ و ، نرخەکەی دوو دینارو روبعێکەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە . وەرگێڕ هەر خۆی سەرپەرشتیی چاپی کردووەو «سینا عەتا»ش نەخشەی بەرگەکەی کێشاوە .

ئەم کتێبەیش وەکو هەندێ لەو کتێبانەی پێشتر مێژووی سپاردنی ساڵی «١٩٨٥»ە ، کەچی ساڵی ١٩٨٦ تەواو بووەو کەوتۆتە کتێبخانەکانەوە .

**٥ – گرنگترین نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکان :**

مامۆستا جەلال خەلەف ژاڵەیی پەیتا پەیتا بابەتی تازەو بەپێز لەبارەی دەروون ناسی‌یەوە پێشکەش بە خوێنەرانی کورد دەکاو ، کتێبخانەی کوردیی دەوڵەمەندتر دەکات و ، سەرچاوەی زانیاری دەخاتە بەردەست لێکۆڵەرەوەو ئەو کەسانەی مەبەستیانە شارەزایی‌یەك لەم رووەوە بزانن . ئەوەتا وا ئەم سالیش – ساڵی «١٩٨٦» – کتێبێکی تازەی بەناوی گرنگترین نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکان پێشکەش کردووین .

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «٢١٦» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣ر٥×١٦ر٥سم»و ، لە چاپخانەی «الجاحظ» لەبەغدا لەچاپدراوە . لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٢٨٧»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و نرخی دینارو نیوێکەو . «سێ هەزار» دانەی لێ چاپکراوە . .

**٦ – گۆڤەند :**

بەرگی یەکەمی ئەو کتێبە کوردی‌یەیە کە کاك نورالدین سعید مصطفی بەشێوە زمانی کرمانجی سەروو لەبارەی فۆلکلۆری کوردی و بەشی گۆرانی‌ی شایی و هەڵپەرکێ بەچاپی گەیاندووە .

کاك نورالدین لەم کتێبەدا کۆمەڵێکی زۆری لەو گۆرانی‌یانە بلاوکردۆتەوە کە لە دەڤەرێ بادینان لەکاتی شایی و هەڵپەرکی‌دا دەگوترین و ، ئاهەنگی شایی و زەماوەندیان پێ گەرم دەکرێ و . خەڵکی ناوچە جیا جیاکانی کوردستان رۆژانی شادو خۆشی‌ی خۆیانیان بەو جۆرە گۆرانی‌یانە بەسەر دەبەن .

گۆڤەند ، بریتی‌یە لە «٨٨» لاپەرەی قەبارە گەورەی « ٢٤ × ١٧سم»و . لە چاپخانەی «علاء» لە بەغدا لەچاپدراوە . لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٢٢١»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و ، نرخی «٦٠٠» فلسەو . «سێ هەزار» دانەی لێ چاپکراوە .

**٧ – نالی لە دادگای رەخنەدا :**

ئەم بەرهەمەی کاك رەئووف عوسمان بریتی‌یە لە دوو ووتاری رەخنەیی کە یەکەمیان بەناوی «نالی لەدادگای رەخنەدا»یەو . دووەمیشیان بەناوی «رەخنەو هۆنراوەو هەڵوێست»ە . کە نووسەر لەنێو دوو بەرگی کتێبێکدا کۆی کردوونەتەوەو بەچاپی گەیاندووەو بەیارمەتی ئەمینداریتی‌ی گشتی‌ی رۆشنبیری و لاوان لەچاپدراوە .

ئەم چاپکراوەی کاك رەئووف «٨٤» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣ر٥×١٧سم»و ، لە چاپخانەی «دار الجاحظ» لەبەغدا چاپکراوە . لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٧٩٥»ی ساڵی «١٩٨٤»ی دراوەتێ و ، نرخەکەیشی «٧٥٠» فلسەو «٣٠٠٠» دانەیشی لێ چاپکراوە . .

ئەم کتێبەیش ئەگەرچی ژمارەی سپاردنی بەکتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی «١٩٨٤» . کەچی ساڵی «١٩٨٦» چاپکردنەکەی تەواو بووەو کەوتۆتە کتێبخانەکانەوە .

**٨ – گوتنێت مەزنان :**

«گوتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان» کتێبێکی برای هێژا «حجی جعفر»ەو ، بەشێوە زمانی کرمانجی سەروو چاپکراوەو . بریتی‌یە لە کۆمەڵە پەندێکی هەمەجۆری ناوچەی بادینان کە لە لایەن دانەرەوە کۆکراونەتەوەو ، پێشەکی‌یان بۆ نووسراوەو . پاشکۆیەکی قەشەنگیان بۆ ئامادە کراوە ، ئەمە جگە لەو فەرهەنگۆکە بەپێزەی کە لە دووا

لاپەڕەکاندا هاتووەو ، ئەو ووشە گرانانەی تیادا شی کراونەتەوە کە لە ناوچەی سۆراندا زۆر باو نین ، هەروەها دانەر نموونەی شیعری هەندێ شاعیری هێناوەتەوە کە لە شیعرەکانیاندا پەندی کوردیو قسەی نەستەقیان بەکار بردووە .

ئەم کتێبە «١٨٤» لاپەڕەی قەبارەگەورەی «٢٤×١٧سم»و ، لە چاپخانەی «علاء» لەبەغدا چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٢٢»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیو ، نرخی یەك دینارەو ، سێ هەزار دانەیشی لیٚ چاپکراوە .

**٩ - لەخەونەکانی نامۆیێك :**

کۆمەڵە چیرۆکێکی کاك «حسن جاف»ی چیرۆك نووسە ، ئەم بەرهەمەی کاك حسن ئەم هەشت چیرۆکەی گرتۆتەوە «چەن ساتێك لە یادداشتەکانی نامۆیێك ، رەشەبا ، کاتێك لە دەرگا نادرێ ، سیبەری دار بەرو ، بازنەیێکی داخراو ، خەون ، راو ، لاوچاك ، یادێکی زیندوو» . مێژووی نووسینی چیرۆکەکان دەگەرێتە بۆ ساڵانی ١٩٧٣-١٩٨٢ .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بریتیيە لە «٨٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی رۆشنبیریو لاوان لە هەولێر لەچاپدراوەو ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٤١٩»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚ ، نرخی ئەم چاپکراوە «٧٠٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەیشی لیٚ چاپکراوە .

هونەرمەند «رافع الناصری» وێنە بەرگەکەی کردووەو ، تابلۆکانی ناوەوە کاك ئاری بابان کردوونیو کاك شێرکۆی خۆشنووسیش ناونیشانەکانی نووسیونەتەوە ، محمد زادەی . هونەرمەندیش سەرپەرشتیی هونەریی کردووە .

**١٠ - منالو جیهانی وەرزش :**

لە بواری ئەدەبی منداڵانیش‌دا ساڵی پار کاك رۆستەم باجەلان نامیلکەیەکی خنجیلانەی پێشکەش بە منداڵانی کورد کردکە بریتیيە لە نزیکەی «٣٦» پارچە شیعری هەمەجۆر دەربارەی هەموو جۆرەکانی وەرزشو چۆنیەتی ئەنجام دانیانو رێنمایی کردنی منداڵان لەو بوارەدا .

کاك رۆستەم ئەم بەرهەمەیٚ پێشکەش کردووە بە گشت منداڵانی جیهانو ، بەتایبەتی ئەو منداڵانەی قوتابیی خۆی بوونو دەرسی پیٚ گوتوون .

ئەم بەرهەمەی باجەلان «٤٨» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢١×٥ر١٤سم»و ، لە چاپخانەی «الحوادث» لە بەغدا چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٦٣٩»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیو ، نرخی «٣٠٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لیٚ چاپکراوە . .

کاك محسن محمدامینو محمد زادە نەخشی بەرگی کتێبەکەیان کردووەو ، دانەر هەر خۆی سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووە . .

ئەوەی شایانی باسە شیعرەکانی ئەم بەرهەمەی باجەلان لەنێوان ساڵانی «٩٨٢-٩٨٤» نووسراونەتەوە . .

**١١ - شانۆگەری بەتورەیی ئاوڕ بدەوە**

**لە ڕابردوو بدەوە :**

شانۆگەرییەکی بەپێزی نووسەری ئینگلیزی «جۆن ئۆزبۆرن»ەو ، کاك شیرزاد حسن لە زمانی ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوەو ، کاك ئازاد حمە شەریف پیێدا چۆتەوە ، وەرگێر زیرەکانە ئەم بابەتە بەنرخەی هەڵبژاردووەو پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کردووە ، ئەوەتا لە پێشەکییەکەیدا دەڵیٚ :

«شانۆگەری - بەتورەیی ئاوڕێ لە ڕابردوو بدەرەوە - یان - بەتورەیی ئاوڕێکی دواوە بدەرەوە - دیاردەیەکی مێژوویی زۆر گرنگی نێو جیهانی شانۆی ئینگلیزی بوو . ڕۆژی «٨»ی مایسی ساڵی «١٩٥٦» ئەم شانۆگەرییە لەسەر تەختەی شانۆی - رۆیاڵ کۆرت - پێشکەش کرا . . ئاوا ئەو ڕۆژە شانۆی ئینگلیزی گەورەترین بزوتنەوەو مەزنترین شۆرشی بەخۆیەوە دی .»

ئەم کتێبە «٢٠٢» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×١٧سم»و ، لە چاپخانەی «دار الجاحظ» لە بەغدا چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٨٥٠»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتیو ، نرخی یەك دینارەو ، سێ هەزار دانەی لیٚ چاپکراوە .

**١٢ - رێنیا بەرانی :**

کۆمەڵە چیرۆکێکی دیکەی برای هێژا «محمد سلیم سواری»یە ، چیرۆك نووس ئەم کۆمەڵەیە دەکاتە دیاری بۆ «مزگینیا بچووك . بۆ . . . مزگینیا مەزن . .» نووسەری هێژا - صبری بۆتانی - پێشەکییەکی کورتو پڕ مانای بۆ نووسیوە ، ئیتر دوا بەدوای ئەم پێشەکییە چیرۆك نووس «دوازدە» چیرۆکی لە دوو توێی بەرگێکی خنجیلانەدا پێشکەش بە خوێنەرانی کورد کردووە ، ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی کاك محمد سلیم بە شێوە زمانی کرمانجی سەروو نووسراوەتەوەو ، بریتیيە لە «١٢٨» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی «دار الجاحظ» لەبەغدا چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٨٨٧»ی ساڵی «١٩٨٦» دراوەتیو ، نرخی «٧٥٠» فلسەو ،

سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوەو ، نووسەر هەر خۆی سەرپەرشتی ی چاپکردنەکەی کردووە .

**١٣ - دیوانی عاجز :**

کۆمەڵە شیعرێکی کوردیی و عەرەبی شاعیری خوالێخۆش بوو «حاجی مەلا سەعید عەبدوڵڵایە» کە لە ساڵی ١٩٢٩ی زایین لە گوندی چل هەویژە لەدایك بووەو ، ماوەیەك بە کاروباری ئایینییەوە خەریك بووە ، زۆر شوێن و ناوچە گەڕاوە ، لەدواییدا لە شاری هەولێر جێگیر بووە ، ڕۆژی ١٩٦٧/٥/٢ کۆچی دوایی کردووە .

ئەم دیوانە «٨٨» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٠×٥ر١٣سم»و ، لە چاپخانەی «علاء» لەبەغدا لەچاپ دراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٨٤٤»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و ، نرخی «٧٥٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

**١٤ - کراشم دڕا چم پێ نەبڕا :**

نامیلکەیەکی خنجیلانەی ڕەنگاو ڕەنگە ، چوار «چیرۆکی فۆلکلۆری کوردەواریی بۆ منداڵان»ی تێدا بڵاوکراوەتەوە ، کە لە لایەن کاك «عمر ابراهیم عزیز»ەوە کۆکراوەتەوەو ئامادەکراوە ، چیرۆکەکانیش ئەمانەن : «کێشکۆکە ، گورگ و مام ڕێوی ، گای ڕەش و ڕێویەکی فێڵباز ، کێشکۆکەو مام ڕێوی» .

ئەوەی شایانی باسە تابلۆکانی نێو نامیلکەکە بەرەنگاو ڕەنگ چاپ کراون و ، لە لایەن کاك «دارا محمد علی»یەوە دروست کراون . .

ئەم نامیلکەیە «٣٦» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٧×٢١سم»و ، لە چاپخانەی «أوفسێتی حسام» لەبەغدا چاپکراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی «٩٧٢»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و ، نرخی یەك دینارەو ، پێنج هەزار دانەی لێ چاپکراوە ، بەڵام تەنها سێ هەزار دانە بەر پارەمەتی کەوتووە ، ئەوەی تری - واتە دوو هەزار دانە - بە پارەی خۆی چاپی کردووە .

**١٥ - دەرەختی - نورز - یش پوازی لە خۆیەتی :**

کۆمەڵە کورتە چیرۆکێکی برای چیرۆك نووس «محمد رشید فتاح»ەو ، لە دووتوێی بەرگێکی قەشەنگدا کۆکراونەتەوە ، چیرۆك نووس ئەم بەرهەمەی پێشکەش دەکات بەو کەسانەی دەیناسن و دەیان ناسێ ، لەپاشدا لە پێشەکییەکەدا دەڵێ :

«ئەم چیرۆکانەم بۆیە هەڵبژاردو خستمنە دووتوێی ئەم کتێبەوە ، چونکە کاتی خۆی خوێندەواران و ڕۆشنبیران کە بەلای منەوە «سەنگی مەحەکن» بۆ هەڵسەنگاندنی گشت بەرهەمێکی ئەدەبی ، پەسندیان کردوون و ، دەدانی خێریان پێدا هێناون ! . .» .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە «١٠٤» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٥ر٢١×٥ر١٤سم»و ، لە چاپخانەی «الحوادث» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٧٠٨»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و ، نرخی «٧٥٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەیشی لێ چاپکراوە .

هونەرمەندی لاو «سەرچڵ شەوقی» نەخشەی بەرگی کێشاوەو . نووسەر هەر خۆی سەرپەرشتی ی لەچاپدانی کردووە . .

**١٦ - ئەو گەڕەکەی بەرەو ئاسمانە :**

«ئەو گەڕەکەی بەرەو ئاسمانە ، گەڕانی شاری سەخت ، داستانی گوندێکی لەبیرکراو ، گەڕانەوەی سالار ، تۆنێل» پێنج چیرۆکی کاك «غفور صالح عبدالله»ن و ، لە دووتوێی بەرگێکی خنجیلانەدا کۆکراونەتەوەو ، دەگەڕێنەوە بۆ ساڵانی «٩٧٨ ، ٩٨٠ ، ٩٨٢ ، ٩٨٣ ، ٩٨٤» .

ئەم چاپکراوە بریتییە لە «١١٢» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی «دار القادسیة» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٨٦٨»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتێ و ، نرخی «٨٠٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

کاك «اسماعیل خەیاتی» هونەرمەند نەخشەی بەرگەکەی کێشاوەو ، کاك «محمد عبدالرحمن زەنگنە»ش سەرپەرشتی ی لەچاپدانی کردووە .

**١٧ - پێلا سێ :**

کۆمەڵە شیعرێکی برای شاعیر کاك «خالد حسێن»ەو . بە هاریکاری ئەمینداریێتی ی ڕۆشنبیریی و لاوان چاپکراوە .

ئەم دیوانەی شاعیر «٣٠» پارچە شیعری هەمەجۆری گرتۆتەوە ، لەوانە شیعری پێلا سێ کە بۆتە ناونیشانی دیوانەکە .

ئەم بەرهەمەی کاك «خالد حسێن» ، «١٠٠» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٠×١٤سم»و ، لە چاپخانەی «علاء» لەبەغدا لەچاپدراوە .

نرخی «٦٠٠» فلسەو ، «٣٠٠٠» دانەی لێ چاپکراوە .

کاك «مختار فائق» سەرپەرشتی ی لەچاپدانی کردووەو ، کاك «نەزار بەزاز»یش نەخشەی بەرگەکەی بۆ کێشاوە . ئەوەی شایانی باسە کاك خالد حسێن ساڵانی ڕابردووش چەند بەرهەمێکی دیکەی چاپکردووە ، وەك «بەرگی یەکەم و دووەمی دیوانی ناڵبەندو ، سڵاڤەك

بو دەلالیٰ ، بومە گوتن ، هەروەها لەگەلٰ کاك احمد عبدالله زەرو بەرهەمێکی چاپکردووە بەناونیشانی « ستراتیٚت شاهیو دیلانا » .

**١٨ – خانزادی سۆران لەکورتە دراماداد :**

ئەم چاپکراوە بریتی‌یە لە رەخنەیەکی دوورو درێژلەسەر دەقوکارە هونەری‌یەکانی شانۆگەریی خانزادیکی تر ، ئەم ووتارە رەخنەیی‌یە کە لە هۆلی رۆشنبیریی جەماوەر لە هەولێردا پێش‌کەش کراوە ، کاك محمد حمد لەگەلٰ چەند زانیاری‌یەکی دیکەو ، فەرهەنگێکی زاراوەکان کە لە باسەکەدا هاتوون ، لە دووتوێی بەرگێکدا بەچاپی گەیاندووە .

ئەم چاپکراوە «٤٨» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦سم)و ، لە چاپخانەی «شفیق» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٠٢٨»ی سالٰی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚ و ، نرخی «٢٥٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لیٰ چاپکراوە .

نەخشەی بەرگی ئەم چاپکراوە کاك سەردار سنجاوی ئەنجامی داوەو ، نووسەر بۆخۆی سەرپەرشتی‌ی چاپەکەی کردووە .

**١٩ – حەسەن زیرەكو هەندێك لە بەسەرهاتەکانی :**

بەشی دووەمی ژیانو بەسەرهاتەکانی هونەرمەندی کورد «حسن زیرەك»ە ، کە لەلایەن کاك میرزا کەریم خۆشناوەوە ئامادەکراوەو نووسراوەتەوە .

ئەم کتێبە کۆمەلێك یادگارو بەسەرهاتو گیروگرفتی رۆژانی ژیانی ئەو هونەرمەندە ناسراوو خۆشەویستەی کوردی گرتۆتەوە . لەگەلٰ کۆمەلە وێنەیەکی دەگمەنی خێزانو بنەمالەی خوالیٚ‌خۆش‌بوو لەگەلٰ نووسەری ئەم کتێبەداو ، وێنەیەکی کورە جوانەمەرگەکەی کاك میرزا کریم .

ئەم چاپکراوە بریتی‌یە لە «١٦٠» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی «دار القادسیة» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٢٧٧»ی سالٰی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚ و ، نرخی دینارو روبعێکەو ، پێنج هەزار دانەی لیٰ چاپکراوە . کاك محمد عبدالرحمن زەنگنە سەرپەرشتی‌ی لەچاپدانی کردووەو ، کاك «نجاة خطاط» نەخشەی بەرگەکەی ئەنجام داوەو ، خەتەکانی نووسیوەتەوە .

**٢٠ – چەپکیٚ لە هۆنراوەکانی سەی وەهاب کاکەیی :**

ئەم چاپکراوە بریتی‌یە لە ژیانو کۆمەلە شیعرێکی سەی وەهاب کاکەیی ، شاعیری ناوچەی گەرمیان . ئەم شاعیرە لە سالٰی ١٩٢٨دا لەدایك بووەو ، لە سالٰی ١٩٣٥دا چۆتە قوتابخانەو بەلاٰم لەبەر هەندی هۆی تایبەتی لەسالٰی ١٩٣٩دا باوکی لەقوتابخانەی دەرهێناوە . سەی وەهاب هەر لەزووەوە دەستی داوەتە شیعر نووسینەوەو ، لەگەلٰ ئەدەب‌دا ئاشنایەتی پەیدا کردووە .

ئەم کتێبە «٩٨» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦سم»و ، لەچاپخانەی «الحوادث» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٠٢١»ی سالٰی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚ و ، نرخی «٧٥٠» فلسەو ، سیٚ هەزار دانەی لیٰ چاپکراوە .

**٢١ – دیوانی ئەحمەد موختار جاف :**

لەزنجیرەی کتێبە یارمەتی دراوەکانی سالٰی ١٩٨٦ دیوانە بەنرخەکەی شاعیری کوردی خوالیٚ‌خۆشبوو «ئەحمەد موختار جاف» بوو ، ئەم دیوانە پرۆفیسۆر دوکتور عیزەدین مستەفا رەسولٰ ئامادەی کردووەو بەراوردی کردووەو لێکیداوەتەوەو پێشەکی بۆ نووسیوە ، بە کۆششی کاك «ئەفراسیاب ئەحمەد موختار جاف» لەچاپ دراوە . لە لاپەرە «٥ ، ٦»دا کاك ئەفراسیاب ووتەیەکی نووسیوە ، دوای ئەو پێشەکیو لێکۆلٰینەوەکەی پرۆفیسۆر دوکتۆر عیزەدین بلاٰوکراوەتەوە کە «٤٠» لاپەرەی دیوانەکەی گرتۆتەوە ، ئیتر شیعرەکانی شاعیر بەپیٚی پیتەکانی دوایی قەسیدەکان بلاٰوکراونەتەوە ، کە سەرجەمی هەموویان دەکاتە «١٠٦» قەسیدە لەگەلٰ چوار مەسنەوی‌یەکەیدا . بۆ ئامادەکردنی ئەم دیوانە پشت بە دوو دەستنووس‌و ، دوو نووسراوەو ، دوو دیوانی چاپکراوو ، هەندی رۆژنامەو گۆڤار بەستراوە کە لە پێشەکی‌یەکەدا بەووردی باسیان لێوە کراوە .

ئەم کارە بەنرخەی دوکتۆر عیزەدین سوودێکی گەورەی هەیە بۆ کتێبخانەی کوردی‌و دەست‌پێشکەری‌یەکی چاکەو خۆزگە شاعیرانی دیکەش لیٚی بیٚ‌بەش نەدەبوون‌و ، بەتێرو تەسەلی بەرهەمەکانیان کۆدەکرایەوەو ، لیٚی دەکۆلٰرایەوە .

ئەم دیوانە «١٩٦» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی «الأدیب» لەبەغدا لەچاپدراوە . لەنامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٧٤٣»ی سالٰی «١٩٨٦»ی دراوەتیٚ و نرخی دوو دینارەو ، پێنج هەزار دانەی لیٰ چاپکراوە . نەخشی بەرگەکەیشی لەلایەن هونەرمەند «ئیسماعیل خەیات»ەوە کێشراوەو ، کاك ئەفراسیاب هەر خۆی سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە .

**٢٢ – فەرهەنگی ئەدیب‌و نووسەرانی کورد :**

بەرهەمێکی تازەی مامۆستا «مصطفى نەریمان»ەو ، بریتی‌یە لە فەرهەنگێکی خنجیلانەی ناوی ئەو ئەدیب‌و نووسەرانەی لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە تاوەکو کۆتایی ساڵی ١٩٨٣ کتێب‌و بەرهەمی چاپکراویان بڵاوکردۆتەوە . ئەڵبەتە ئەمەیش کارێکی بەسوودە بۆ ئەرشیڤی کوردی‌و ئەو کەسانەی مەبەستیانە لێکۆڵینەوەو بەسی ئەدەبی لەبارەی ئەدەبی کوردی‌یەوە بنووسنەوە .

ئەم کتێبەی مامۆستا نەریمان «١٥٦» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦سم»و ، لەچاپخانەی «أسعد» لە بەغدا لەچاپدراوە ، لەنامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٢٣٨»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و نرخی یەك دینارەو سێ هەزار دانەیشی لێ چاپکراوە .

**٢٣ – بەردەباز :**

برای شاعیر کاك «مکرم رشید تاڵەبانی» دوای ئەوەی لە ساڵی «١٩٧٨»و «١٩٨٠»دا دوو دیوانە شیعری دیکەی بڵاوکردۆتەوە بەناوی «شەپۆلی ئاواز»و «ژیلەمۆی راز» ، وا لە ساڵی «١٩٨٦»یشدا کۆمەڵە شیعرێکی دیکەی بەناوی «بەردە باز»ەوە ، خستە کتێبخانەکان‌و ، پێشکەشی خوێندەوارانی کوردی کـرد . شیعرەکانی کۆمەڵەی بەردەباز دەگەڕێنەوە بۆ ساڵەکانی «١٩٨٣ ، ١٩٨٤ ، ١٩٨٥» . .

ئەم بەرهەمەی شاعیر «٩٦» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٥ر٢١×٥ر١٤سم»و ، لە چاپخانەی «الزمان» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٢٦١»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخی «٥٠٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

بۆ زێدە ئاگاداری ، کاك مکرم لە ساڵی «١٩٥١» لە شاری خانەقین لەدایك بووە ، لە ساڵی «١٩٧٠»دا دەستی بەنووسین کردووە ، لە ساڵی «١٩٧٤»دا بەشی زمانی کوردی لە کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا تەواو کردووە ، جگە لە بەرهەمە شیعری‌یە چاپکراوەکانی ، لە زوربەی گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یەکان‌دا نووسینی بڵاوکردۆتەوە .

**٢٤ – کوێخا سێوێ :**

دوای دوو ساڵ گیروگرفتی چاپ‌و چاپخانەو ، هات‌و چوونی نێوان بەغداو هەولێر ، عەزیزی مەلای ڕەش ڕۆمانی کوێخا سێوێ‌ی وەکو دیاری‌یەکی بەنرخی خۆی‌و سەرەنجامی ئەرکی ئەو دوو ساڵە ماندوو بوونەی پێشکەش بە خوێنەرو کتێبخانەی کوردی کرد .

نووسەر بەبێ پێشەکی‌و ، لە ٣٨ بەش‌دا ناوەرۆکی ڕۆمانەکەی خستۆتە ڕووو ، لە کۆتایش‌دا فەرهەنگۆکێکی خنجیلانەی بۆ ووشە گرانەکانی نێو ڕۆمانەکە داناوە .

کتێبی ئەم جارەی مەلا عەزیزی مەلای ڕەش «٢٤٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣×١٦سم»و ، لە چاپخانەی ڕۆشنبیری‌و لاوان لە هەولێر لە چاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١١٠٩»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخی «دینارو ڕوبعێکە»و ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە . . کارە هونەری‌یەکانیشی عەزیز حەریری ئەنجامی داوون . .

**٢٥ – پەرەنگ :**

چوارەمین کۆمەڵە چیرۆکی برای چیرۆك نووس کاك «عبدالله سەراج»ەو ، بە یارمەتی ئەمینداریتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی کوردستان لە چاپدراوە ، ئەم کۆمەڵەی کاکە سەراج «١٢» چیرۆکی گرتۆتەوەو ، لەوانە حەوت چیرۆکیان لە گۆڤارە کوردی‌یەکان‌دا بڵاوبوونەتەوە .

ئەم بەرهەمەی کاك عبدالله «١٢٠» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی «دار القادسیة» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٢١٢»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخی «٨٥٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

کاك محمد عبدالرحمن زەنگنە ئەرکی لەچاپدانی گرتۆتە ئەستۆ . کاك عبدالرحمن جعفر ناونیشانی چیرۆکەکانی بەخەتی دەست نووسیوەتەوەو ، کاك ئیسماعیا خەیاتی هونەرمەندیش نەخشەی بەرگەکەی کێشاوە . .

**٢٦ – بەفرا ل ڤیێ :**

یەکەمین بەرهەمی شاعیری هەرێمی بادینان کاکە «محسن قوچان»ە ، بەیارمەتی ئەمینداریتی‌ی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوان لەچاپدراوەو «٢٠» پارچە شیعری گرتۆتە خۆ . لە بەرگێکی خنجیلانەدا کۆکراونەتەوە ، لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٦دا کەوتۆتە کتێبخانەکانی کوردستان .

ئەم بەرهەمەی شاعیر ٧٢ لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٢٠×١٥سم»و ، لە چاپخانەی «أسعد» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٠٥٨»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخی «٦٠٠» فلسەو ، «٣٠٠٠» دانەی لێ چاپکراوە . ئەوەی شایانی باسکردنە بەرگی ئەم کۆمەڵە شیعرە لە چاپخانەی «وسام» لە بەغدا لەچاپدراوە . .

**۲۷ – دلڤین :**

بەرهەمێکی تازەی کاکە «کریم جمیل بیانی»یەو ، بریتی‌یە لە «۹» چیرۆکی هەمەجۆرو ، لە دوو توێی بەرگێکی خنجیلانەدا کۆکراونەتەوە . چیرۆکەکانیش ئەمانەن : «گرنژین ، کوفنێ کومتێد بلند ، ل رۆژەکا بەفرین ، رێڤینگێ وەغەرا دویر ، هرمیکا خرش ، دلڤین ، چاڤێد تەو رویبارو بازێرێ من ، شیرینێ ، هیڤی» . لەگەڵ هەر چیرۆکێکیش‌دا تابلۆیەك بڵاوکراوەتەوە .

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە کە بەشێوە زمانی کرمانجی سەروو نووسراونەتەوە «۸۰» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «۲٤×۱۷سم»و ، لە چاپخانەی «الجاحظ» لە بەغدا لە چاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی «۱۲٤۸»ی ساڵی «۱۹۸٦»ی دراوەتێ‌و ، نرخی «۹۰۰» فلسەو ، «۳۰۰۰» دانەی لێ چاپکراوەو ، کاك فهمی باڵایی نەخشەی بەرگ‌و تابلۆکانی کێشاوە .

**۲۸ – چیرۆك‌و بەیتی «لاس‌و خەزاڵ»و «زەمبیل فرۆش» . .**

کاك سعدالله اسماعیل شێخانی لەم یەك دوو ساڵەی دوایی‌دا کەوتە کۆشش‌و زیرەکانە تاوەکو کۆتایی ساڵی ۱۹۸٦ توانی سێ بەرهەمی پوخت‌و بەپێز لەبارەی فۆلکلۆری کوردی‌یەوە ئامادە بکات‌و بەرێك‌و پێکی بەچاپیان بگەیێنێ‌و ، بە دڵسۆزی‌یەوە فریای بەشێکی سامانی نەتەوایەتیمان بکەوێ‌و ، بەتۆمارکراوی‌یەوە بیخاتە بەردەستی خوێنەرو نووسەرانی کوردەوە ، ئەگەرچی ئەم کارە هەوڵ‌و کۆشش‌و شارەزایی‌یەکی زۆری دەوێ ، بەلام هەرچی چۆنێ بێ ئەو برا نووسەرە لاوە ئەوەی بۆی کرابێ کردوویەتی ، ئەڵبەتە ئەم هەوڵدانەیشی مایەی پیرۆزبایی لێکردنە . ئەوەتا ئەم جارەیش بە کۆششێکی زۆرەوە چیرۆك‌و بەیتی «لاس‌و خەزاڵ»و «زەمبیل فرۆش»ی ئەنجام داوەو ، واش چاوەڕوان دەکرێ بەرهەمی تریشی بەدەستەوە بێ‌و ، لە ساڵانی داهاتوودا پێشکەشی کتێبخانەی کوردی‌یان بکات . .

ئەم بەرهەمەی کاك سعدالله «۱۰۸» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «۲۳×۱۷سم»و ، لە چاپخانەی «أسعد» لە بەغدا لە چاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی «۱۲۳۷»ی ساڵی «۱۹۸٦»ی دراوەتێ‌و ، نرخی «۷۵۰» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

هونەرمەند اسکندر عثمان وێنەی بەرگەکەی بۆ کێشاوەو ، کۆمەڵێ برای نووسەرو شارەزاش لە بارەی فۆلکلۆرەوە ، بە بەرهەمەکەدا چوونەتەوەو یارمەتی نووسەریان داوە .

**۲۹ – شانۆگەریا مەمێ ئالان :**

مەمی ئالان چیرۆکێکی کۆنی ئەدەبی کوردیمانەو تا ئێستا کۆمەڵێك نووسەر لێیان کۆڵیوەتەوەو ، لە زۆر رۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکان‌دا لەبارەیەوە نووسراوە ، تەنانەت بە شانۆگەریش لە هەندێ شاری ناوچەی کوردستان‌دا پێشکەش کراوە ، زۆر لە دەنگبێژە کوردەکانیش ئەم داستانە بەپێزەیان فەرمۆاش نەکردووەو ، بە کاسێت‌و بە گۆرانی تۆماریان کردووەو ، لەم دوایی‌یەشدا بەزمانی عەرەبی داستانەکە بە دوو کتێب کەوتە کتێبخانەکانەوە ، ئەوەتا واکاك «بائیز عمر احمد»یش وەکو دڵسۆزێکی فۆلکلۆری کوردی ئەم داستانە ناودارەی کردۆتە شانۆگەری‌و لە دوو توێی بەرگێکی نایابدا خستوویەتیە بەردەستی خوێنەرانی کورد .

شانۆگەریا مەمێ ئالان ، «۸۰» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «۵ر۲۳×۵ر۱٦سم»و ، لە چاپخانەی «الجاحظ لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی «۱۰۵۲»ی ساڵی «۱۹۸٦»ی دراوەتێ‌و ، نرخی «۹۰۰» فلسەو ، «۳۰۰۰» دانەی لێ چاپکراوە ، نووسەر بۆ ئامادەکردنی ئەم شانۆگەری‌یە سوودی لەهەشت سەرچاوەی جۆرراوجۆر وەرگرتووە .

**۳۰ – دلێنی :**

چاپکراوێکی خنجیلانەی خوشکی شاعیرو نووسەر «سەرفراز علی نقشبندی»یە ، کە لە دوو بەش پێکهاتووە ، بەشی یەکەمی بریتی‌یە لە «حەیرانۆك» ، کە «۱۲٤» پارچە حەیرانۆکی هەمەجۆری گرتۆتەوە ، بەشی دووەمیشی «مەتەڵ»ەو ، «۱۰۲» مەتەڵی کوردەواری ، یاخود راسترە گەر بڵێین قسەی نەستەقی پێشینانی گرتۆتەوە . ئەمە جگە لەوەی کە خوشکە سەرفراز لە لاپەڕە سێ‌دا شیعرێکی بەناوی «دیاری»یەوە بڵاوکردۆتەوە ، هەروەها لە لاپەڕە «۵ ، ٦ ، ۷»دا ، ووتەیەکی نووسیوە بەناوی «گوتنەکا پێدڤی» کە تیایدا باسی چۆنیەتی کۆکردنەوەو ئامادەکردنی ئەم بەرهەمە دەکات ، مامۆستا «صبری بۆتانی»یش پێشەکی بۆ نووسیوە ، وەکو خوشکە سەرفراز خۆیشی دەڵێ وادیارە ئەم بەرهەمە لە ساڵی ۱۹۸۱ ئامادەکراوە بۆ چاپ ، بەلام لەبەر هەندێ ئەگەرو تەگەرەی تایبەتی بواری بڵاوکردنەوەی نەبووە .

«دلێنی» – ۷۲ – لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی‌یە «۵ر۲۱×۵ر۱٤سم»و ، لە چاپخانەی سۆمر لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی «۱٤۱۲»ی ساڵی «۱۹۸٦»ی دراوەتێ‌و ، نرخی «٦۰۰» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە . .

ئەم چاپکراوە بەشێوە زمانی کرمانجی سەروو نووسراوەتەوەو ، بریتی‌یە لە فۆلکلۆری کرمانجی .

کاك «غیاث علي نقشبندی» نەخشەی بەرگەکەی کردووەو ، لە کۆتایی ساڵی «١٩٨٦»دا کەوتۆتە کتێبخانەکانەوە .

**د - کتێبە عەرەبی‌یەکان :**

**ئەمانەی خوارەوەیش بەشێکی ئەو کتێبانەن کە بەزمانی عەرەبی چاپکراونو بلاوبوونەتەوەو ، یارمەتی نووسەرەکانیان دراوە . .**

**١ - «٣٣٣» سؤالا وجوابا :**

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە «٣٣٣» پرسیارو وەڵام لەبارەی رووەکەکانی جوانی‌و داری مێوەو سەوزی کە لە عیراقدا هەنو لەگەڵ ئاوو هەوای ئەم وولاتە گونجاون . کتێبەکە لە لایەن ئەم سێ زاتە بەرێزە دانراوە :

«دوکتۆر نجم طاهر رسول ، دوکتۆر عبدالله صالح عباس ، دوکتۆر کریم صالح عبدول» کە هەر سێ دوکتۆر لەم بوارەدا شارەزاو پسپۆرنو خاوەنی تاقیکردنەوەی خۆیانن . . ئەم کتێبە کارێکی بەسوودە بۆ ئەو کەسانەی مەبەستیانە شارەزایی لە بارەی رووەکەوە پەیدا بکەنو هەندێ نهێنی لەم رووەوە بزانن .

ئەم چاپکراوە «٣٠٨» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی زانکۆی «موصل» لە چاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٣٣»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخەکەی دوو دینارو نیوەو ، سێ هەزار دانەیشی لێ چاپکراوە .

دوکتۆر طاهر هەر خۆی سەرپەرستی‌ی چاپکردنی کردووەو ، بەشی نەخشە سازیش لە چاپخانە نەخشەی بەرگەکەیان کێشاوە .

**٢ - دول العالم :**

کتێبێکی تازەی مامۆستا «هادی رشید چاوشلی»یە کە لە ساڵی ١٩٨٦دا کەوتە کتێبخانەکانەوەو ، بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوەو ، ئەمینداریتی‌ی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان یارمەتی چاپکردنی داوە .

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەیەکی کورت دەربارەی دەسەلاتەکانی دەوڵەت لەرووی دەستووری‌و راپەراندنو یاسادانانەوەو ، هەروەها کاروباری ئیداری‌و رژێمی سیاسی‌و ئابووری ، لەگەڵ هەندێ مەسەلەی گشتی لەبارەی یاساو . دەزگاو رێکخراوەی دەوڵەتی‌و ، گیروگرفتی دەوڵەتان لە جیهاندا . .

ئەم لێکۆڵینەوەیە «٥٦٠» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣×٥ر١٦سم»و ، لە چاپخانەی «الجاحظ» لەبەغدا لەچاپدراوە ، لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٩٩٠»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخی «٤» دینارەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە .

«هیوا محمد علي» هونەرمەند نەخشەی بەرگی کتێبەکەی ئەنجام داوەو ، نووسەر هەر خۆی سەرپەرشتی‌ی چاپکردنی کردووە .

**٣ - حكايات عن الجبل وأيامنا العراقية الجميلة :**

دووەمین بەرهەمی برای نووسەر کاك «عبدالوهاب طالباني»یە ، کە لە ساڵی ١٩٨٦ بلاوی کردووەو کەوتە کتێبخانەکانەوە ، دوای ئەوەی لەسەرەتای هەشتاکانەوە کۆمەڵە چیرۆکێکی بەناوی «پێکەنینی خۆرەوە» بۆ منداڵان بەچاپ گەیاندو بلاوی کردەوە چیرۆکەکانیش لە زمانی عەرەبی‌یەوە وەرگێردرابوون .

ئەم بەرهەمەی نووسەر بریتی‌یە لە کۆمەڵە ووتارێك دەربارەی باری ئێستای وولاتو ، ئەو جەنگە نارەوایەی رژێمە توخم پەرستەکەی ئێران بەسەر وولاتەکەمانی داسەپاندووە ، لەگەڵ هەندێ ووتاری دیکە کە پەیوەندی‌یان بەبۆنە نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌یەکانەوە هەیەو ، کاتی خۆی لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی وەکو «الثورة ، العراق ، وعي العمال ، صوت الفلاح ، ئۆتۆنومی»دا بلاوی کردوونەتەوە .

ئەم کتێبەی نووسەر «٨٠» لاپەرەی قەبارە ناوەنجی «٥ر٢١×٥ر١٤سم»و ، لە چاپخانەی «الزمان» لەبەغدا لەچاپدراوە . لە نامەخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٩٩٨»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخی «٤٠٠» فلسەو ، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە . .

**٤ - المرأة في الفكر الاسلامي :**

کتێبێکی ئایینی‌یە بە یارمەتی ئەمینداریتی‌ی گشتی رۆشنبیری‌و لاوانو بە زمانی عەرەبی لەچاپدراوە ، ئەم کتێبە لە لایەن جمال محمد فقی رسول الباجوری دانراوەو کاتی خۆی پلەی «ماجستێر»ی لەسەر وەرگرتووە ، بریتی‌یە لە کۆمەلە باسێکی ووردو بەپێز دەربارەی ئافرەت لە روانگەی بیرو باوەری ئیسلامەوە .

ئەم کتێبە بەدوو بەش چاپکراوە ، بەشی یەکەمی بریتی‌یە لە «٢٨٨» لاپەرەو ، بەشی دووەمیشی بریتی‌یە لە «٢٦٠» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦سم»و ، لەچاپخانەی زانکۆی موصل لە نەینەوا لەچاپدراوە ، لە ناماخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «٨٤٦»ی ساڵی «١٩٨٦»ی دراوەتی‌و ، نرخی هەر بەرگێکی دوو دینارەو ، هەر یەکەیشی سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە . .

**• بلاوکراوی دیکە :**

